# تەوبە

**مامۆستا مەلا محەممەدی رەبیعی**

یا رەب من تەوبەی پەشیمانیمەن
وادەی ئەڵوەدای کۆچ جوانیمەن
هەرچەن جەی وەرتر نەقزم کرد پەیمان
مەئیووس نیم جەتۆ بە نەقز ئیمان
یا هەرچەن جورمم بێ حەساو کەردەن
بەیەکتایی تۆ شیرکم ناوەردەن
هەرچێوم کەردەن جە نافەرمانی
سەرکەشی نیەن غەیر لە نادانی
ئیسە قەلب من مایل وەلای تۆن
ئومێدەش پەناوسایەی ولای تۆن
هەرچەن تەبع من ئالوودەی هەوان
تەنیا رێبەری ورەحم تۆش دەوان
چون ناکاملەن وێنەی سەغیرەن
تەحت تەئیسرەن وێنەی ئەسیرەن
ئەمما شاگردێ با ئیستعدادەن
پەی تەحریر جەید چقەید ئامادەن
هەرنە تەحوێڵەن چون نەشئەی خەلیل
هەتا "وَجَّهْتُ"ش مەبۆ وە دەلیل
ئیسە چون هذا هذای ئەووەلێن
هەرها نەتەحقیق زومرەی ئافلێن
چون یاواوە مەرز یەکتا پەرەستی
بێ باکەن جەلەوم ئەفکار پەستی
کەی بۆخواکەی بیاووم وەحەد؟
وە هەمزەی ئەحەد لابەم نوقتەی خەد
گێرۆم نەئاغۆش شاهیدی مەقسوود
فەرامۆشم بۆ ئەعرازی وجوود
ئەو شووشەی تەوبەم چەن جار شکاوان
هێشتا هەر کوێرم ، نیەنم تاوان

# ناوەڕۆک




چاپ: از شرکت ایرانچاپ
تلفن: ٣٢٨١


وێنەی سەربەرگ :
گومی سەرسەکو
لەشاری بوکان
دیاری کاک خالیدی قەلعەکووهی
وێنەی پشت بەرگ:
تەشی ریس
دیاری کاک نادری قازی

گۆواری ئەدەبی ـ فەرهەنگی
سروە
لە ژێر چاودێری دەستەی نووسەران
ناونیشان : ارومیه ـ خیابان شهید
باکری ـ نزیک کوی ساعد ـ انتشارات
صلاح الدّین ایوّبی ( مرکز نشر فرهنگ
و ادبیّات کردی ) تلفن : ٢٥٨٠٠


وێڕای سڵاو و پیرۆزبایی (سروە) بە ئێوە خوێنەرانی بەرێز بەبۆنەی ساڵڕۆژی سەرکەوتنی پڕ شکۆی شۆڕشی ئیسلامی ئێران و تێکەوەپێچانی تۆماری حکوومەتی سەر شۆڕانەی شاستەمکارەکان سەروتاری ئەمجارەمان دەس پێدەکەین .

**(تعهد)ی قەڵەموقەڵەمی (تعهد)**

**تێ بینی**

لەژمارەی پێشوو داوێڕای باس لەسەر خاسیەتی ئامراز بوونی قەڵەم دواین گوتمان قەڵەم وەک تیغێکە باخەوان درووی پێ هەڵدەپەرتێوێ و غەیان خوێنی پێ دەرژێنێ "

هەروەها گوتمان بەرفراوانی و گیرایی زمانی قەڵەم ، پاراوی و تەئسیری خێرای نووسینەکان هەروەها ئاسان و هەرزانی دەستکەوتنی بڵاو کراوە .تەبلیغاتییەکان بوونەتە هۆی ئەوەکە ئاپۆرەیەکی زۆر لەدەوری کۆبێتەوە وژمارییەکی زۆرتریش لەبەروبووی بەهرە وەرگرن ،ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەکە وێڕای هەوڵدانی بەکەڵک وئینسانی نووسەرانی

دەروەست ، دوژمنانی مرۆڤایەتی وەخۆ کەون شەپۆلێکی بەسام و گەورەی نووسینی دزێو وتێکدەرو رووخێنە روەرێ بخەن بۆلەنێوبردنی ئیستعدادەکان،هونەرو قەریحە پاکەکان و پالادان و بەردەستکردنیان .

دیسان کوتمان ئیستعماری بیروفکر کەبۆزال بوون بەسەرتەواوی بارەکانی ژیانی خەلک هەل ومەرجی بنەرەتی پێویستە ،ئامانجێکە کەسیاسەتمەدارەکانی ئیستکبارو ئیلحاد لەقەلەمی چاوەروان دەکەن .لەدوایی‌دا وێرای بانگ هێشتنی هەموو ئازادبیران و (اولوا الالباب) لەرێبازی خەباتی راستی و بنەرەتی دژی ئیستعماری قەلەم وبەهرەوەرگرتنی‌بەچاکە لەقەلەم بەلێنیمان دا کە ئەگەربلوێ هیندێک لەبارەی (تعهدی ) قەلەم بدوێین .

**"تعهّد" چیەو چەتایبەتی‌یەکی هەیە**

"تهعد "وشە یەکی عەرەبی‌یەو لە (عەهد )ەوە هاتووەومانای پەیمان دەدا ،دەروەست یا "متعهد" بەکەسێک دە گوتری کەپەیمانی بەستووە ولەسەر پەیمان و بەلێنی سوورە . بەشێوەیەک کەئەم پەیمانە ببێتە ئەسلێکی سابت‌ونەگۆراوە ولەبیروکردەوەی ئەودا دیار بێ .

کاتێک باسی "تعهد"دەکرێ دەبێ بەوردی روون بکرێتەوە وشی بکرێتەوە بۆئەوەش دەبێ وەلامی ئەم پرسیارە بدرێتەوە **کەتعهدسە بارەت بەکێ وعەهدو پەیمان چیە ؟ چەتایبەتی‌یەکی هەیە ؟**

بۆروون کردنەوەیەکی پترلەولامی ئەو دووپرسیارەدا لەپێشدا بەکورتی مانای لێدەدەینەوە ودوایەتایبەتی یەکانی " تعهدی قەلەم" ویا خۆ دەروەست بوون سەبارەت بە ستەمکارو تاغووتی یەکان و خێوی فێلو تەلەکە دەخەینە بەرباس

**تعهدسەربارەت بەکێ و عەهدو پەیمان چیە ؟**

ئاشکرایە کە لەچوارچێوەی بیرو بروایەکی هاوبەش بەشی زۆری ئێمەی کورددا تعهد لە قیبالی خودا دایە، واتەئێمە لەبەرابەری خودا دا "متعهدین" وهەر بەم بوئەوە هیچ قەیدیکی جگە لەخودا ناسەلمێنین .

هەرچەندە پێویستە پەیوەندی دوو لایەنەی "تعهدالهی " و " تعهدغیرالهی " بخەینەبەرباس بەلام چون ئەوەسووژەیەکی عەقیدەتی یە لێرەدا خۆی لێ دەبوێرین بەلکوو بە یارمەتی خودا لە جێی خۆیدا بەرەسمی لێ کۆلینەوە وبە شێوەیەکی زانایانەی تەواو بیدەینە بەرباس ولێکۆلینەوە(١)

ئەوە روونەکە ئەم بەرنامەی بە "تعهد"سەبارەت بە خودا دێتە گۆرێ تەنیا بەپەیرەندی نێوان عەبدوخودا و عیبادەت ورازونیاز نابرێتەوە بەلکولەتەواوی بارو دۆخی ژیانی ئادەمیزادە دا (لە بچووکترین واحیدی کۆمەلایەتی رابگرە هەتا گەورەترینی)پەیوەندیەکانی ژیانی ئەودیاری دەکاجالێرە دایە کە دەتوانین عەهد بناسێنین . پەیمانی ئێمە لەم (تعهد)ەدا بەرێوەبردن و حاکم کردنی ئەم پەیوەندی یانەیە .

ئێستا بۆمان دەرکەوت کە چۆن لێپرسراوی لەبەرابەر کۆمەلی خەلک و بەکورتی هەموو شتێک "لەجیهاد و نەباتەوە هتد ..." لە (تعهد) سەبارەت بەخوداوە سەرچاوە

---

(١) پێویستە ئەوەش رابگەیەنین کە ئێمە لەوانەنین کە بمانەوێ عەقیدەیەک دەرخواردی خەلک بدەین کە دەستکرد بێ و رێ لە خەلک هەتلە بکا وەک ئەوانە کەلەهەرە دوورترین ولاتانی جیهانرا عەقیدەوبیرو رایەک بەقەرز وەردەگرن ودەیکەنە پاشکۆی فەرهەنگی خەلک ، ئەوان غافلن لەوە کە

وصلە ناچسبکی ماند بجا
غافلان ازهوشیاران کن جدا

لەم پێیەدا چاوپێداگێرانێک بە واقیعیەتی بەرچاوو بایخەرەسەنەکانی شەریعەتی محەممەدی (د.خ ) لەهەموو سەرلێ شێواوی یەک دوورمان دەخاتەوە .

دەگری و چلون ئەوەی لە بەرابەر ئەمری خودادا دەروەستە سەربارەت بەفەرد وەهەموو ئەجزای جیهانی خولقاو بەتایبەت خەلک دالە هەموان بەر پرسرو لی پرسراوترە

بەپێی ئەم مەبەستەی باسمان کردو بەپێی ئەم ناسینەیکە لە (عهدوتعهد) لە زەینی خوینەرانی بەریزدا یە دەتوانین تایبەتی یەکانی (تعهد)ی قەلەم )شی بکەینەوە وبەناوی بەشیک لە تعهدی تیکرایی و هەموو لایەن باسی لی بکەین .

ئەم ئوسوولەی قەبوول کراوە پەیوەندی بە چەشنی (تعهد) ومەوزووعی (تعهد)-ەوە هەیە کە دەبی لە هەموویدا دەوری قەلەم بە ئاشکرا دیاربی ومیعیاد و محەکیک بی بوهەلسنگاندنی نووسراوەکان بەوپی یە .

بەلام بە جاری ئەم مەبەستە

بەلام بە جاری ئەم مەبەستەش رابگەیەنین کە ئەم باسە تەنیا بەقەلەم بەلکوو بەهەموو تیکوشانە فەرهەنگی یەکان کە بە شیوەیەک پەیوەندی یان بە بیرەوە هەبی مەربووت دەبی لە لایەکی ترەوە دەبی بزانین کە لازمەی راستی ئەو باسەتەنیا بەو مەرجەتەواوە کە ( بەکەلک وەرگرتن لە ئامار ورەقەم ووینەی واقیعی ومەسەلەی بەجی و...) باسی لی کرابی کە ئەوەش لەوەها وتاریکدا جیی نابیتەوە وناگونجی لیبراو هەلیدەگرین بوباسەکانی عیلمی وهونەری و... ولەویدا باخاوەنراکان لە سەری بدوین ولیی ورد ببنەوە وئیمەش بە پیی توانا وبەلەبەرچاو گرتنی حال ووەزعی خومان سەیری ئەم بەشە لە گولزاری عیلم وئەدەب دەکەین.انشاالله

تایبەتی یەکانی تەعەهودی قەلەم وقەلەمی تەعەهو.

(تعهد)ی قەلەم وقەلەمی (تعهد) دوو تەعبیرن لە مانایەکدوو وینەن لە شتیک واتە (تعهد)ی قەلەم هەر ئەو مەبەستەیە کە ئەگەر بە دەستی قەلەمی (تعهد)ی بسپیری حاسل دەبی ویا (تعهدی قەلەم) هەر ئەوەیە کە لە قەلەمی (تعهد) دەتکی .ئیستاش قەلەمی دەروەستگەلیک تایبەتی هەیە کەلە شوینەوارەکەیدا دەبی دیاربی وەک

## ١ـ لانەدان لەئوسوول

یەکیک لەو مەبەستە ئەساسی یانەکە لەم چەشنە باسانەدا ئەگەر بە راستی رەچاو کری ئەسالەت وسەداقەتی هەر جوولانەوەیەک دەپاریزی ودەنا بە پیچەوانە هەر کەمتر خەمی یەک زەرەیەکی قەرەبوو نەکراوە بە بار دینی وواهەیە ١٨٠ لە ریبازی ئەسلی لاماندا .

**" لادان لە ئوسوول لە هیچ هەل ومەرجێکدا کارێکی دروست نیە ، هیچ کارێک بەبێ لەبەرچاوگرتنی ئەو رەوا نیە وگۆڕانی زەمان و مەکان نابێتە بیانووی پێ شیل کردنی ".**

لە جێگایەکی تردا چۆنیەتی ئەو تەئسیرەی گۆڕانی زەمان لە نێوەرۆکی نووسیندا پێکی دێنێ دەخەینە بەرچاو و زیاتر لەم بابەتە دەکۆڵینەوە ،بەلام هەر لێرەدا بەپێویستی دەزانین رابگەیەنین نووسەر نابێ بەهیچ بیانوویەک ئوسوول وەلابنێ و ئەگەر وای کرد موتەعەهید نیە وخەیانەتی کردووە ،هەم بەکۆمەڵی نووسەر و قەلەم بەدەست ، هەم بەوانەی تامەزرۆی خوێندنەوەن .

ئێمە نالێین کە باوەڕمان بە گۆڕانی هەل و مەرج نیە و قەلەم نابێ تەئسیر لەوئاڵ و گۆڕانە وەربگرێ. بەپێچەوانە زۆریشی پێ لەسەر دادەگرین، بەلام مەبەستمان ئەوەیە کە نابێ ئوسوول بکەین بە قوربانی ئەو ئاڵ و گۆڕە و بۆ خۆرێکـ خستن لەگەڵ هەل و مەرجی نوێ چوارچێوەی کار تێک بدەین.بۆ وێنە ئەگەر

گۆڕانی هەل و مەرج بە شێوەیەک بێ کە شێوەی نووسین و ئەو وشە و زاراوانەی جاران باو بوون لە زەمانی ئێستا باو نەبن، یا ئەو بابەتانەی کە زەمانێک بابەتی ڕۆژ بوون و قسەیان لەسەر دەکرا گرینگی خۆیان لەدەست دابێ ئایا ناتوانین دەستێکیان تێوەر بدەین و نەزمێکی نوێ بۆ کاری داهاتوومان لەبەر چاو بگرین ؟

گومان لەوەدا نیە کە نەک هەر هەقی خۆمانە بەڵکوو دەبێ بە ئەرکی خۆمانی بزانین بەپێی هەل و مەرج گۆڕانێکی لەبار لە نووسینی خۆماندا پێک بێنین بەڵام گۆڕانێکی وا کە نەبێتە هۆی تێک چوونی چوارچێوە و ئەساسی کار و لە ڕێبازی ئەسڵیمان دوور نەکاتەوە.

ئەگەر لەو بڕوایەدا بین کە بۆ خۆ ڕێک خستن لەگەڵ نەزمی نوێ دەتوانین ئوسوول پێ شێل بکەین، هەروەها ئەوەشمان لەبەر چاو بێ کە بەپێی گۆڕانی هەل و مەرج لە داهاتوودا نەزم و شێوەی کاریش دەبێ بگۆڕدرێ، ئەو وەختە ئوسوولیش پەیتاپەیتا دەگۆڕدرێن. لە لایەکی دیکەوە لادان لە هەر ئەسڵێک بە مانای دەست هەڵگرتن لەو ئەسڵە و قەبوول کردنی ئەسڵێکی ترە بۆ ماوەیەکی تر.

ئەگەر واشی لێهات بەو مانایە کە هیچ ئەسڵێکی سابت و نەگۆڕاو نامێنێ کە وەک میعیار بتوانین پشتی پێ ببەستین.

بەڵام ئەمەش لەگەڵ ئەسڵی تەعەهود کە لە سەرەتای ئەم باسەدا پێمان لەسەر داگرت یەک ناگرێتەوە. (لە لایەکی ـ ترەوە ئاشکرایە ئەگەر ئەسڵێکی سابت و لە گۆڕان نەهاتووی وا قەبوول نەکرێ، کە لە هیچ هەل و مەرجێکدا گۆڕانی بەسەردا نەیە ڕێگایەکی قانوونی بۆ ئەنجامی هەر چەشنە خەیانەتێک بە بیانووی گۆڕانی هەل و مەرج ئاوەڵە دەکرێ.

بەرلەوەی درێژە بەم باسە بدەین سەرنجتان بۆ ئەم ڕاستییە ڕادەکێشین کە مەسەلەی " **بوون یا نەبوونی ئەسڵێکی سابت لە جیهاندا** " باسێکی قووڵی فەلسەفییە و کێشەیەکی زۆری لەسەرە، بەڵام سەرەڕای ئەوەی کە باسێکی زۆر جوان و گرینگ و شیرینیشە ناچارین خۆی لێ ببوێرین. لێرەدا هەر ئەوەندە کە بە زمانێکی سادە توانیومانە ئاسەواری خراپی نەبوونی بڕوا بە ئوسوولێکی سابت و ئاوەڵە ـ کردنی ڕێگای لادان لە ئوسوول بە بیانووی گورانی هەل و مەرج ڕوون بکەینەوە واز لەم باسە دێنین و دەگەڕێینەوە سەر باسی پێشوو.

زۆربەی خوێنەرانی ئێمە شارەزایی یەکیان لەگەڵ " **ئستراتژی**" و " **تاکتیک** " هەیە. بەداخەوە لە زمانی کوردی و فارسیدا وشەیەکی هاوتای وامان نیە کە پڕ بە پێستی بێ و بەتەواوی جیگای ئەم دوو وشە بگرێتەوە. بەڵام بەکورتی دەتوانین بڵێین، " **ئستراتژی" بریتییە لە ئامانج و ئوسوولی بنەڕەتی و بەرنامەی دوارۆژ، "تاکتیک" بریتییە لەو ڕێگا و شوێنانەی کە بە کردەوە بۆ گەیشتن بەمەبەست دەگیرێنە پێش و ئەو بەرنامە کەم خایەن و کاتییانەی کە لە هەل و مەرجی جۆراوجۆر وادیاری دەکرێن.**

وێڕای ڕاکێشانی سەرنجێکی زیاتر بۆ پەیوەندی نێوان "ئستراتژی" و " تاکتیک " بەڕاشکاوی دەتوانین بڵێین کە " **تاکتیک"هەرچەندە ئاڵ و گۆڕیشی بەسەردا بێ ئامرازێکە بۆ گەیشتن بە " ئستراتژی"یەکی سابت.** بەپێی ئەم تاریفە دەتوانین بڵێین **ئەو قسە کە دەڵێ تاکتیکی واهەیە لەگەڵ ئستراتژی یەک ناگرێتەوە، قسەیەکی باتڵ و نادروستە.**

بۆ ئەوەی ڕاستی ئەم قسەمان لێ دەرکەوێ سەرنجی فەرد یا دەستە یا دام و

دەزگایەک بدەیـــن کـــە " استراتژی" یەکی تایبەتـی بۆخۆی دیاری دەکا و بەکردەوە بۆ گەیشتن بە ئامانـــــج تاکتیکی واهەڵدەبژێرێ کــە لەگەڵ استراتژی دیـــاری کراودا ناتەبایی هەیە . ودا

کێ دەتوانێ زامنی ئـەوە بێ کە ئیدیعای ئەو فەرد یا دەستە و دام و دەزگا یـــە دیاریکردنی" استراتژی" یـە تایبەتی یەکەیدا،ئیدیعا یەکی دروستە ؟ ئایا ڕێگـــادان بەکەلک وەرگرتـــن لـــە تاکتیکی وا ،بە کردەوە ڕێگـا بۆ ئینسانی دوودیـــن و مونافیق ناکاتەوە کە هەرچی پێی خۆشە بیکا و هەرکە لـە گیرکەوت یان لێیان لـە هەڵلاّ دا بلێ ئەو قسەیەم یا ئەوکارەم تەنیا تاکتیکێـک بووە و هیچیدی ؟ باشتریـن چەکی دەستی ئینسانـــی مونافیقیش هەر ئەمەیە .ئایا دۆستایەتی ئینسانـــی وا جێگای دلخۆشی یە ؟ئایا ئەو ئیدیعا یە یان داو نانەوەیەک نیـە ؟

**ئایا هەدەف وەسیلە تـەوجیە دەکا ؟**

بووەتە قسەی سەرزار و زمانان کە ( لە نووسبن وئاخاوتنـدا ) دەلێن هەدەف وەسیلـــە تەوجیە دەکا ،ئێمە لێـرەدا دەمانەوێ وڵامێک بۆ ئـــەم پرسیارە بدۆزینەوە .مەبەست لەم قسە ئەمەیە کە بـــۆ گەیشتن بە ئامانج بە هـــەر ڕێگـایەکدا بڕۆین هـــەر دروستە . یانی بۆ ئـەوەی بە ئامانج ( ئوسوول و **استراتژی**) بگەین دەتوانین لەهەر وەسیلەیەک (**هەر شێوە و تاکتیکێک** ) کەلک وەربگرین کەوابێ دەکرێ شێوەوتاکتیکی وا هەڵبژێرین کە دژ بە هەموو ئوسوول و ڕێ و شوێنی دیاری کراو بێ و با هەڵبـــــژار ـ دنیشیان استراتـــژی و چوارچێوەی پێشوو بە تەواوی تێک بدا .لێرەدایـە کـــە دەتوانین لـە وەڵامـــی پرسیاری سەروودا بڵێیـــن : **ناهەدەف وەسیلە تـەوجیە ناکا** و ئەو وەسیلانەی بـــۆ گەیشتن بە ئامانج کەلکیـان لێ وەردەگیرێ دەبێ لەگـەڵ ئوسوول یەک بگرنەوە ،دەنـا بە بیانووی گەیشتن بـــە ئامانج ڕێگا بۆ هـــەر چەشنە خەیانەت و جینایەتێک دەکرێتەوە .هەروەک ڕێڕەوانی ئەم ڕێبازە وا دەکەن .

کەوابوو **قەڵەمی هـەر نووسەرێکی " متعهد " خۆی لـە بوختان و پێوەهەڵبەستـن ، درۆ ، پیاوخراپکردنی خەڵک ، بڵاوکردنەوەی فەساد ،بایەخ ـ دان بەو داب و شوێنـــە دزێوانەی بەرەویان پەیـدا کردووە یا بە پێچەوانە ،حاشا لە واقیعییەت بەرچاوتەنگی بەهۆی خۆش ویستن و بوغزاندن ( چاو قووچاندن لە چاکـەی دوژمن و خراپەی دۆسـت بی ئینسافی،تەعەسوبی کوێـر ، خەیانەت لە ئەمانەت ، دزی ( لە نووسەرانیتر ) و دەست تێوەردان لە قسەونووسراوەی نووسەرانی دیکە ( وەختـی گێڕانەوە )** دەپارێزێ و ئەم ڕاستی و ڕووراستی یەش تەنیا بە مەبەستی ڕێزدانان بـــۆ ئەسڵێکە کە لەم وتـــارەدا خستمانە بەرباس "لانەدان لە ئوسوول".

**درێژەی هەیە**

بسم الله الرحمن الرحیم

# «سرمقاله»

با عرض سلام و تبریک "سروه" به شما خوانندگان محتـــرم بمناسبت سالروز پیـروزی شکوهمند انقلاب اسلامی ایران و درهم‌پیچیده شدن طومـار حکومت ننگین شاهان ستمگر سرمقاله را آغاز می‌کنیم .

" تعهدقلم و قلم تعهد "

**تذکـره :**

در شمارهٔ پیش ضمن بحث دربارهٔ خاصیت ابزار بودن

بروانه ل ۷۸

لە ژمارەی پێشوودا ئەم باسمان گەیاندە جێگایەک کە گوتمان دیاریکردنی زمانێکی یەکگرتووی ئەدەبی لە هەر وڵاتێکدا پێویستە. هیچ زمانێک نیە کە لەهجەی جۆراوجۆری نەبێ. دانیشتوانی هەر شار و مەڵبەند و تەنانەت گوندێک لەهجەی تایبەت بە خۆیان هەیە، بەڵام بۆ پەیوەندی گرتن لەگەڵ یەکتر، بۆ دەرس خوێندن، بۆ بڵاوکردنەوەی کتێب و گۆوار و رۆژنامە و.... زمانێکی یەکگرتووی ئەدەبیان دەوێ.

هەروەها گوتمان لە وڵاتێکی فرەنەتەوەدا کە دانیشتوانی ناوچە جۆر بە جۆرەکانی زمانی جیاوازیان هەیە، باش وایە کە وێڕای **دیاریکردنی زمانێکی یەکگرتووی هاوبەش بۆ هەموو وڵات، هەر نەتەوەیەکیش ئازاد بێ زمان و فەرهەنگ و ئەدەبیاتی خۆی پەرە پێ بدا.**

بەڵام لێرەشدا مەسەلەی دیاریکردنی زمانی یەکگرتووی ئەدەبی هەر لە گۆڕێدایە. چونکوو هەرکام لە زمانە ناوچەییەکانیش بۆ خۆی لە چەندین لەهجە و بن لەهجە پێک هاتووە. هەر وەک هەموو وڵات نیازی بە زمانێکی یەکگرتوو هەیە، زمانە ناوچەییەکانیش دەبێ بە جێگای خوێندن و نووسین بە هەموو لەهجەکان زمانێکی ئەدەبی تاقانە بۆ خۆیان دیاری بکەن. لە دیاریکردنی ئەم زمانە ئەدەبییە ناوچەییەشدا، هەروەک زمانی یەکگرتووی وڵات دەکرێ عامیلی **سیاسی** یا **ئایینی** یا **ئابووری و بازرگانی** یا... دەتوانێ تەئسیر دابنێ. باسەکەمان دێنینە سەر زمانی یەکگرتووی ئەدەبی کوردی و ئەم مەسەلانەی تێدا دەخەینە بەر باس و لێکۆڵینەوە.

### لەهجەکانی زمانی کوردی

تا ئێستا بۆدابەشکردنی لەهجەکانی زمانی کوردی بە دوو یا چەند لەهجەی ئەسڵی هەوڵێکی زۆر دراوە. بە رای ئێمە باشترینیان دابەش کردنی بە سێ لەهجەی ئەسڵییە لەلایەن مامۆستا ع.ئ.زەبیحی یەوە کە بریتی یەلە:

"١ـ لەهجەی شیمالی (باکووری) کە ئەم بن لەهجانەی تێدا بەدی دەکرێ: هەرکی، شکاکی، جەلالی (بایەزیدی)، هەکاری، بۆتی جزیری، عفرینی، دومبلی (زازا)، بادینی، ...

٢ـ لەهجەی ناوەندی کە بەغەڵەت پێی دەڵێن لەهجەی سۆرانی. ئەوەی راست بێ (سۆرانی) بن لەهجەیەکی ناوەندییە. لەم مەڵبەندەدا ئەم بن لەهجانە هەن: موکریانی، سۆرانی، سولەیمانی، شوانی، جافی سنەیی، گەڕووسی....

٣ـ لەهجەی جنووبی کە ئەم بن لەهجانەی تێدا بەدی دەکرێ: کرمانشانی، کەلوڕی، کولیایی، پیروەندی، لەکی و لوڕی [1]!...»(٢)

(١) لەسەر ئەوەی کە لوڕی بە لەهجەیەک لە فارسی یا کوردی دەژمێردرێ یاخۆ زمانێکی سەربەخۆیە رای جیاواز هەیە

لە رابردوودا هەل و مەرجێکی وا نەهاتۆتە پێش کە یەکێک لەو هۆیانەی پێشتر باسمان کردن لەدیاری کردنی زمانی یەکگرتووی ئەدەبی کوردیدا کاریگەربووبێ و لەهجەیەکی بەسەر ئەوانیتردا زاڵ کردبێ . دەسەلاتی سیاسی لەم بوارەدا بێ تەئسیربووە. دەوڵەتێکی سەر بەخۆی کورد ، هەر نەبووە و هیچدەوڵەتێکی عەداڵەتخوازی دڵسوزیش لەو ولاتانەداکە کوردیان تێدا ، دژی نەهاتۆتە سەرکار کە خۆی بەم کارەوە ماندوو بکا. پێغەمبەرێکمان لێ هەڵنەکەوتووە کە کتێبی ئاسمانی خۆی بە زمانی کوردی هێنابێ و ئەسپاردەکەی بەم زمانە راگەیاندبێ . بەبۆنەی ، پاشکەوتوویی ئابووری ولاتە - کەشمانەوە زیاتر لەوەی شارە کوردنشینەکان مەڵبەندی بازرگانی وئاڵ و گۆڕی کەل و پەل بن ، بازاڕی شارە فارس و تورک و عەرەب نشینەکان وەک تاران، تەورێز ،بەغدا ئەستەموڵ ، بەبرەوبوون و بازرگانی کورد رووی تێ کردوون .

سەرباری هەموو ئەمانەش جگە لەکوردستانی عێراق کە ئەویشپاش خەباتێکی درێژ خایەن سەر بە حکوومەتی پاشایەتی ئەوکاتەیعێراق ، شۆڕ کراو دەروێک بۆ ئازاد. بوونی زمانی کوردی کرایەوە لەوبەشانەی ولاتە کوردنشینە- کانی ئێران و تورکیادا کە زوربەی کوردەکانی تێدا ، نیشتەجێن حکوومەتەتاغووتییە ملهوڕەکان سەرەتایی ترین مافە نەتەوایەتی و فەرهەنگییەکانی گەلیکوردیان پێشێل دەکرد و خوێندن و نووسین بە زمانی زگماکی کوردی و تەنانەت لەتورکیای پاش دەسەلاتداری کەمالیستە - کاندا قسەکردن بەم زمانەیان قەدەغە کردبوو ،وبەپەیڕەوی کردن لەسیاسەتێکی شۆڤینیستی و دژی ئینسانی و دژی ئیسلامی بۆتواندنەوەی ئەم میللەتە چەندمیلیۆنییە لەنێو میللەتانی بەدەستەلا - تدا تێدەکۆشان .

لە کوردستانی عێراقیش کە ئەم مافە تارادەیەک دابین کراوە ، لەبەر نەبوونی دام و دەزگایەکی دلسۆزی هونەر پەروەر ، سیاسەتێک بەڕێوەدەچێ کە درێژەدانی دەبێتە هۆی پووچەڵ و بێنێوەرۆک کردنی زمان و فەرهەنگ وئەدەبی کوردی . لەو ولاتەدا بە پێی زیاد و کەمی ژمارەی لاپەڕە- کانی هەر کتێب و نووسراوە- یەک بایەخ و نرخیان بۆ دادەنرێ . ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی کە هەر نائەدیبێک خۆی بێنێتە ریزی نووسەرانەوە و کتێبی قەبە وبێ نێوەرۆک پێشکەش بە بازاڕی ئەدەبی کوردی بکا .

لە مێژووی ژیانی ئەدەبی کوردی لەو ولاتەدا نموونەی بەرچاوی هەوڵدانی رووخێنەرا- نەی بەئانقەست زۆر هەیە ، بۆ وێنە سەفارەتی ئینگلیس لەبەغدا بۆ ماوەیەک گۆواری، **" دەنگی گێتی تازە "**ی بلاوە دەکردەوە کە جگە لەتێکدان و لە گرێژەنەبردنی چوارچێوەی زمانی کوردی و برەودان بە بازاڕی وشەداتاشین ئەرکێکی دیکەی بە ئەستۆ نەگرتبوو ، ئێستاش نموونەی ئەم چەشنە تێکۆشانە بە ئاشکراوبەنهێنی کەم نیە ، کە بەرهەمەکەی بریتییە لە وکتێب وگۆوارانەی یەک لەدووی یەک بلاو دەبنەوە .

**ئەڵبەت هەوڵ و تێکۆشانی ئەو مامۆستا پایەبەرزانەی کە لەو دەرفەتە کەلکیان وەر گرتووە و بەبێ سەرنجدان بە باری ماددی و قازانجیشەخسی خۆیان ، بۆ ژیاندنەوە و بووژاندنەوەی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی هەوڵ دەدەن جێگای رێز و سوپاسە.ماڵیان ئاوەدان بێ و خودا بۆ کوردی بێ بەشیان بپارێزێ.**

ئێستاشکە لە ئاکامی شۆڕشی پڕ شکۆی ئیسلامیدا ، دەرەتانێکی باش بۆ گەلی کورد نەک هەرلەئێران بەڵکوو

---

(٢) پێشەکی قامووسی زمانی کوردی ع.ا. زەبیحی بەرگی یەکەم ل ٤٢

لە ناوچەدا رەخساوە جێگای
خۆیەتی کە بۆ تێهەڵێنانەوەی
رابردوو ، هەوڵێک بدرێ .
کەم و کووڕی تابڵێی زۆرە و
گەلێک دەرد هەن کە دەرمانیان
دەوێ . ئەوەی لێرەدا جێگای
باسە ژیاندنەوە و بووژاند-
نەوەی زمان و فەرهەنگ و
ئەدەبی کوردی و هەڵبژاردنی
زمانی یەکگرتووی ئەدەبی
کوردییە .

هەرچەند وەک لەسەرەوە باس
کرا تائێستا هەل ومەرجێکی
وا پێک نەهاتووە کە زمانی
یەکگرتووی ئەدەبی کوردی
دیاری بکرێ ، بەڵام لە
مێژووی دوو سێ قەرنی پێش
لەئێستای وڵاتەکەماندا خولی
وا بەرچاو دەکەوێ کە
دەسەڵاتێکی بە هێزی سیاسی
لەبەشێکی ناوچەکوردنشینەکا-
ندا گووراوە وبۆ ماوەیەک
زمان و ئەدەبی کوردی ،
کەوتۆتە گەشەکردن .لەهەرکام
لەم سەردەمانەشدا یەکێک لە
لەهجەکانی کوردی بەسەر
ئەوانی تردا زاڵ بووە .

لە سەردەمێکدا کە جزیر و
بۆتان میرنشین بوون لەهجەی
کوردی شیمال کراوەتە زمانی
رەسمی و ئەدەبی کوردی و
بەدامەزرانی دەسەڵاتی
ئەردەڵانەکان لە شارەزوور ،
مەیدان بۆ گەشەکردنی لەهجەی
گۆران ئاوەڵە بوو . ئەم
لەهجەیە بۆماوەیەک لەئاخر و
ئۆخری سەدەی سێزدەهەمی
کۆچیدا وەک زمانی رەسمی
کوردی پەرەی گرت . پاشانیش
کە لە نیوەڕاستی سەدەی ،
حەقدەهەمی زایینیدا سوڵتان
مورادی چوارەم بەغدا و شارە-
زووری گرت و ئەردەڵانەکان
ئەومەڵبەندەیان بەجێ هێشت
و بەرەو کوردستانی ئێران
گەڕانەوە ، لەهجەی گۆران ،
پاڵەپشتی سیاسی خۆی لەدەستدا.
بەسەقام گرتنی دەسەڵاتی
بابانەکان لەسەدەی نۆزدەهە-
مدا لەهجەی کوردی نیوەڕاست
گەشەی کرد . لەوسەردەمدا کە
دەتوانین بڵێین شۆڕشێکی
ئەدەبی لە زمانی کوردیدا
بەرپاکرا ، شاعیری پایەبەرز
وبەناوبانگی وەک نالی ،کوردی
سالم و ... سەریان هەڵدا و
شیعرو ئەدەبی کوردییان ،
گەیاندە سنوورێکی دوورەدەست.
ئەم شاعیرە بەناوبانگانە
هەموویان بە لەهجەی کوردی
نیوەڕاست شیعریان داناوە و
**جێگای سەرنجەکە نالی بۆپێک
هێنانی زمانی یەکگرتووی ،
ئەدەبی هەوڵێکی زۆری داوە و
لەشیعرەکانی خۆیدا لە وشەو
زاراوەی ناوچە جۆربەجۆرەکان
کەلکی وەر گرتووە**کەبێگومان
لەقسەکردنی ئاسایی خۆیدا ،
(کەخەڵکی شارەزوور بووە) بە
کاری نەبردوون وتەنیا
مەبەستی لەوکارە پێک هێنانی
زمانی یەکگرتوو بووە ، وەک
دەڵێ :

**پەرچەمی روو دادەپۆشێ پێچی**
**زولفی پێچەیە**
**"دا" بە رۆژیش پێی بڵێن**
**شەمعی شەبستانی هەیە**

* * *

**ئەی میهری میهرەبان وەرەسەر**
**بامی بامداد**
**"دا" مەهرووان ببن بەهیلالی**
**شەوی میحاق**

لەم شیعرانەدا بە جێگای
"تا" لە "دا" کەلکی
وەرگرتووە .ئەم وشە پێش لە
شەڕی یەکەم لە ناوچەی
موکریاندا باو بوو و ئێستا
مەگەر لە هێندێک ناوچەدا
مابێ .

لە جێگایەکی تردا لەهجەی
ناوچەی سنە لە شیعرەکانیدا
دەگونجێنێ و دەڵێ :

**دائیم لە دووتە مێگەلی**
**ژن نێرگەلی پیاگ**
**بەم ریشەوە لە پێشەوەبووگی**
**بە سەر گەلە**

هەر وەها لە غەزەلێکیدا
سێ وشەی "من" و "ئەز" و
"ئەمن" بەکار دەباکە هەر
یەکەیان لە ناوچەیەکی
کوردستاندا باوە .

ناری سینەم گەر نەبێ غەرقم
"ئەمن"
ئاوی چاوم گەر نەبێ سووتاوم
"ئەز"

* * *

ئەی رەفیقان سوحبەتی نالی
مەکەن
بۆچ کە "من"لەورا وەکوو
بەدناوم "ئەز"

لەم سەردەمەبەدوا زوربەی شاعیران و نووسەرانی کورد هەرئەم رێبازەیان گرتووە . بەتایبەتی لە کاتی دەسەلاتدا- ری شێخ مەحموودی حەفیددا زمانی رەسمی کوردی ، هەر لەهجەی نێوەڕاست بوو و هەموو نامەوکتێب ورۆژنامە- یەک هەر بەم شێوە دەنووسراو بلاودەکراوە . ئێستاش دەبینین کە ئەملەهجە زیاتر لەوانی تر خزمەتی پێ کراوەو گەشەیەکی زیاتری کردووە .

راستەکە لەهجەی کوردی شیمال زمانی بەشێکی زیاتر لە خەلکی کوردستانەو شاعیرو عارفی مەزن و پایەبەرزی وەک مەلای جزیری ، ئەحمەدی خانی ، فەقێ تەیران ، عەلی حەریری ، و ....شیان لێ هەلکەوتووەکە ئاسمانی شیعر و ئەدەبی کوردیان پێ رازاوەتەوە و کورد هەتاهەتایە شانازیان پێ دەکا ، بەلام هەروەک گوتمان کەمی و زۆری دانیشتوانی ناوچەیەک و تەنانەت گرینگی سیاسی و ئەدەبیش نابێتە هۆیئیمتیازێکی تایبەتی بۆ لەهجەیەک لە هەلبژاردنی زمانی یەکگرتووی ئەدەبیدا .

**لە لای ترەوە پێویستە بەربەرەکانێ یەکیزۆرتوندیش لەگەل بەکارهێنانی دوو یا چەندلەهجەی زمانیکوردی بکرێ چونکوو ئەمە دەبێتە هۆی لاوازبوونی زمانەکەمان . هیچ میللەتێک ئەم کارەی نەکردووەو وکوردیش دەبێ خۆی لێ بپارێزێ .**

لە هەل و مەرجی ئێستادا بە بۆنەی دەولەمەند بوونی لەهجەی خزمەتپێ کراوی ، کوردی نێوەڕاست لە چاو لەهجەکانی دیکە، ئەمشێوە ئاخاوتنە بۆ زمانی یەکگرتوو لەبارترە و لەلای دیکەشەوە بەکردەوە هەرئەم لەهجەیە کە لە ئەدەبیاتی کوردیدا جێگای خۆی کردۆتەوە وخۆی بەسەر لەهجەکانی دیکەدا سەپاندووە . بەتایبەتی لە کوردستانی ئێراندا ئەگەر بمانەوێ ، لەهجەیەکی دیکە بۆ نووسین هەلبژێرین ، یادەبێ هەر واز لە نووسین بێنین یا خۆ لەسەری رابوێستین تا وردە وردە شاعیر ونووسەرە لاوەکا- نی شیمال یا جنووب دەست بدەنە قەلەم و لاوەکانی دیکەش خۆیان بە فێربوونیئەو لەهجانەوە خەریک بکەن. کە وابێ باشتر ئەوەیە هەرنەبێ لەم کات و شوێنەدا یانی لە هەل ومەرجی ئێستایکوردستانی ئێراندا کە دەرەتانی بلاوەکردنەوەی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی پێک هاتووە لەهجەی کوردی نێوەڕاست لەبەرچاو بگیرێ و ئەم ئیمکانە باشەمان کەخوا یارێ پەرەش دەگرێ لەدەست نەچێ .

**ئەگەر دەلێین لەهجەی کوردی نێوەڕاست جێگای خۆی لە ئەدەبی کوردیدا کردۆتەوە وبۆتەزمانی یەکگرتووی ئەدەبی ، بەومانانیە کە کارتەواو بووە و نیازێکی بە باس و لێکۆلینەوە و خۆپێوە ماندووکردن نەماوە .هێشتا لە نێوان نووسەر وزاناکاندا ئەم مەسەلە کێشەی لەسەر دەکرێ و تاگەیشتن بە بۆ چوونێکی وەک یەک رێگایەکی دوورو درێژمان لەبەرە .تازە لەهجەی کوردی نێوەڕاست بۆ خۆی لەچەند لەهجە (سلێمانی موکری ، سنەیی ، سۆرانی ) و چەندین بن لەهجەی دیکە (هەر شارو ناوچەیەک بن لەهجەی تایبەت بە خۆی هەیە ) پێک دێ وئەوەی کە کام لەهجەیا بن لەهجە وەک ئەساس ، هەلبژێردرێ خۆی جێگای باسە .**

لەدارِشتنی بناخەی زمانی یەکگرتووی ئەدەبی کوردی دا هەلبژاردنی لەهجە یا بن لەهجەیەک بەمانای دانانی مافی تایبەتی بۆ ئەو لەهجە و وەپشت گوێ خستنی لەهجەکا- نی تر نیە .زمانی یەکگرتووی ئەدەبی کوردی ئی هەموو کوردە و تایبەت بەناوچەیەک نیە و نابێ . دوای دیاری کردنی زمانی یەکگرتووی ئەدەبیش ئەو زمانە بە رێبازێکی تایبەتیدا گەشەدەکا و پەرە دەگرێ وبەرەوتەکامول دەڕوا . بەشێوەیەک کە دوور نیە پاش ماوەیەکی کورت ، جیاوازی یەکجار زۆر

لەگەڵ لەهجە هەڵبژێردراوەکە پەیدا بکا .

زمانی ئەدەبی لە ڕەوتی فەراژۆی خۆیدا لە وشە و زاراوەی هەموو ناوچەکانەکەلک وەردەگرێ و وشەو زاراوەی ناڕەسەنی لێ بژار دەکرێ . بۆوێنە "**سێوک**" وشەیەکی کورت ولەزارسووک ورەسەنی کوردییە کە لە کوردی شیمالدا هەیە ، لە کوردی موکریدا "**پێرەڵماسی**" پێی دەڵێن کە ئازەرییە ، لە کوردی سنەییدا دەبێ بە "**سێف زەمینی**" کەفارسی یە ، کوردەکانی ئەودیویش پێی دەڵێن "**پەتاتە**" کەئینگلیسی یە . جائەگەر لە کودری ئەدەبیدا "**سێوک**" بەکاربێنین نەک هەر هیچ تاوانێکمان نەکردووە . بەڵکوو کارێکی زۆر بەجێ و رەوایشمانکردووە

جگە لەم چەشنە ئاڵ و گۆڕە یش پەرەگرتنی وەزعی ژیانی مرۆڤ و داهاتنی ئامرازی نوێ ،و هات و چوو پەیوەندی نێو گەلان دەبێتە هۆی داهاتنی وشەی تازە و هێندێک وشە لە زمانی بێگانەوە دێنە نێو زمان ،بۆ هێندێکیش وشەی نوێ دادەتاشرێ . ئەڵبەت ئەو پەتای پەیدابووە وهەر نووسەر و نانووسەرێک بەکەیفی خۆی وشەی تازە دادەتاشێ و شتی سەیر وسەمەرە دێنێتە نێو زمانی کوردییەوە کارێکی زۆر ناڕەوایە و دەبێ بەرگری لێ بکرێ . بەڵام ئەگەرکۆڕێک لە ماموستا ، شارەزاو خاوەن راکان پێک بێ و ناتەواوی و کەم و کووڕی زمان بە داتاشینی ئوسوولی و بەجێی وشە پڕ بکەنەوە کارێکی خیلافیان نەکردووە . هیچ زمانێک نیە کە پێویستی بە دانان وداتاشینی وشەی نوێ نەبێ ، ئەمما ئەم کارەش ئوسوولێکی هەیە کەدەبێ لە بەر چاوبگیرێ .

لەگەڵ ئەوەی کە زمانی ئەدەبی هەتاکوو دێ لە لەهجەی ئەسڵی دوور تر دەکەوێتەوە ،گەلێک عامیلیتر یش دەبنە هۆی نزیکبوونەوەی لەهجە جیاوازەکان . خوێندن و نووسین بە زمانی یەکگرتوو ، بڵاوکردنەوەی کتێب و گۆوار و رۆژنامە و بەرنامەی رادیۆ و تلۆویزیۆن بەم زمانە لە سەر هەموو لەهجەکان تەئسیر دادەنێ و بەرەبەرە لێکیان نزیک دەکاتەوە .

**جگەلەمانەیش دیاری کردنی زمانی یەکگرتووی ئەدەبی بەمانای بەزۆر لەنێوبردنی لەهجەکان و تواندنەوەیان لە نێو زمانی یەکگرتوودانیە بەڵکوو دەبێ مەیدان بۆ پەرەدان بەفەرهەنگ و فۆلکلۆری هەموو ناوچەکان ئاوە لەبێ . پەرەدان بە** فەرهەنگ و زمان و لەهجەی هەر مەڵبەندێک دەبێ بەهۆی **پەرەگرتنی تێکڕای فەرهەنگی نەتەوەکەمانو ودەوڵەمەندتر بوونی.زمانی یەکگرتووی ، ئەدەبی . کەوابێ دەبێ لە پەنای زمانی دیاری کراوی ، یەکگرتووی ئەدەبیدا شیعر و فۆلکلۆری هەر ناوچەیەک بە لەهجەی خۆیان بڵاو بکرێتەوە وڕێگا لەگەشە کردنی ئیستیعدادەکان نەبەسترێ . بەڵام جگە لە شیعر وفۆلکلۆر هەربابەتێکی دیکە چ پەخشانو چیرۆک بێ و چ بابەتەزانستیەکان و... هتد بە زمانی یەکگرتوو بنووسرێ و لە بەکارهێنانی چەند لەهجە بۆ نووسین خۆ بپارێزین .**

**( تەواو )**


سەرچاوەکان

۱- زبان شناسی و زبان فارسی **دکتر پرویز ناتل خانلری**

۲- چهار گفتار در بارە زبان **دکتر محمد رضا باطنی**

۳- زمانی یەکگرتووی کوردی **دوکتۆر جەمال نەبەز**

۴- ئەرکی بەیان لە هەل و مەرجی ئێستادا **پاشەرۆکی ماموستا هێمن**

۵- کورد و سەر بە خۆیی زمان **ماموستا هەژار**- گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد بەرگی دووهەم ۱۹۷۴

۶ - پێشەکی قامووسی زمانی کوردی م.ئ. **زەبیحی**

# مەعاد چیە

مامۆستامەلاعبداللە مظفری

مەعاد یانی ئەو کاتەی کە مەخلووقات بۆ لێکدانەوەی ئاکار و کردەوە و فیکر و بیر و باوەڕی خۆیان بە تێکرایی لە بارەگای عەدالەتی ئیلاهیدا کۆ دەبنەوە،ئەوانەی چاکەیان کردووە جەزای چاکەیان دەدرێتەوە و تاوانبارەکانیش "ئەگەر خودا لێیان نەبووری" بۆ سزادانەوە مل کەچ دەکەن.

بۆ روون کردنەوەی ئەم باسە سەرنجتان بۆ ئەم خالانە رادەکێشین:

١ ـ هەرچەند مەعاد لە زمانی عەرەبیدا بە مانای ئەو "جێگا"یە کە بەرەو ئەوێ دەگەڕێینەوە، بەلام چونکوو لە هەموو یا زوربەی ئەو جێگایانەی قورئاندا کە باسی ناوەکانی قیامەت دەکرێ واتای کات و زەمان گونجاوە ، وەک : "**یوم الحسره، یوم الحساب ، یوم القیامه، یوم الدین ، یوم الفصل ، الیوم الاخر ، یوم تبلی السرائر**، ئەو رۆژەی کە نهێنییەکان ئاشکرا دەبن." باش وایە مانای مەعاد بە "کات"ی گەڕانەوە بەرەو خودا لێ بدەینەوە.

٢ ـ وەک گوتمان ، مەعاد بە مانای کاتی گەڕانەوەیە ، ئەو کاتەی کە ئینسان لەدوای دەورەیەک فێر بوون و هەولدان ، لەدوای بڕینی هەوراز و نشیوی ژیانی ئەم دنیایە ، لەدوای بڕینی ڕێگای کەمال و بەختەوەری یا رۆیشتن بەرەو زەلکاوی سەر لێ شێواوی و دلڕەقی ئامادەیە بۆ وەرگرتنەوەی جەزای چاکە و سزای تاوانەکانی .

بۆیە بەو زەمانە دەگوترێ مەعاد، کە خودای تەبارەک و تەعالا ئێمەی خولقاندووە و لەسەر ئەم دنیایەی داناوین ، تا بە کەلک وەرگرتن لەو نیعمەتانەی پێی داوین و بە پەیرەوی لە رێنوێنی پێغەمبەرانی خودا ( د ـ خ ) و بە یاریدەی عەقل و هۆشی خوا پێداومان کە وەک پێغەمبەرێکی دەروونی رێگای چاک و خراپمان پێ نیشان دەدا ، خۆمان بگەیەنینە دوامین پلەکانی تەکامول، ئەمەشمان لە نێوەرۆکی ئایەی شەریفەی "**انا لله**"وە بۆ دەردەکەوێ ، کە ئێمە بە بەندەی خودا و مەملووکی ئەو دەناسێنێ .

خودای مەزن دەفەرمێ : "ئێمە دەستوورمان بە ئادەم و حەوا و ئیبلیس دا کە لە بەهەشت بێنە خوارێ ( و لەسەر زەوی نیشتەجێ بن ) کە وابێ ئەو کەسەی لە هیدایەتی من پەیرەوی بکا ترسێکی نامێنێ ، بەلام ئەوانەی کافر بن و ئایاتی ئێمە تەکزیب بکەن ، هەمیشە لە ئاوری عەزابدا دەبن." ( ١ )

ئەم ئایەتە پیرۆزە دەتوانێ "**انا لله**" تەفسیر بکا ، وادەگەیەنێ کە

---

( ١ ) قلنا اهبطوا منها جمیعا فاما یاتینکم منی هدی فمن تبع هدای فلاخوف علیهم و لاهم یحزنون

سورەء بقرە ٢/ ٣٨

مەبەست لە هاتنە سەر زەوی ئینسان ئەوەیە قۆناخەکانی تەکامول بپێوێ و ڕێگای بەهەشتی جاوید بگرێتە بەر و لە عەزابی جەهەننەم خۆی دەرباز بکا ، ئینسان لەو کاتەدا کە دوایی بە تەمەنی دێ ، بەرهەمی ژیانێکی پڕ لە تێکۆشانی ئەم جیهانەی وەک تێشووی ئاخیرەت بە کۆڵەوە دەگرێ و تۆماری ئاکار و کردەوەی خۆی لە بارەگای خوداوەندی میری مەزندا دەکاتەوە ، لەو کاتەدایە کە بۆ وەرگرتنەوەی ئاکامی کارەکانمان روو دەکەینەوە خودا و هەر ئەمەیە رۆیشتن بەرەو مەعاد و جێگای گەڕانەوە کە لە جوملەی " **انا الیه راجعون** " دا دەستنیشان کراوە .

٣ ـ گوتمان کە رۆژی قیامەت کاتی " دوایین لێ پرسینەوە"یە چونکوو :

یەکەم ـ لە دوای حەشری مەخلووقات و چوونە بەهەشتی بەهەشتی یەکان و کەوتنە جەهەننەمی تاوانباران ، دەرگای عەمەل لەسەر ئەو مەخلووقاتە دادەخرێ و حیسابی عەمەل دوایی دێ ، ئیتر دوای ئەوە هیچ کەس ناتوانێ کارێکی باش یا خراپی وا بکا کە موستەحەققی جەزا یا سزادان بێ ، ئەو حوکمەی خودا دەیدا نە باتڵ دەبێتەوە و نە بۆ ئەوەش دەبێ جارێکی تر چاوی پێدا بخشێتەوە ، چونکوو حاکمی موتڵەق لەو دادگایەدا هەر خودایە و زەڕڕە چیە هەڵە و خیلاف لە ئەحکامیدا نیە ،شتی وا تەنانەت بە مێشکیشما ندا نایە .هیچ کەسێکیش ناتوانێ شتێک بەسەر خودا دا بڕێ .

هەرچەند هێندێک لە بەدکاران کە دوای مردن ( تەنانەت بەر لە رۆژی قیامەتیش ) راستی قسەکانی پێغەمبەرانی خودایان لێ دەردەکەوێ و لە کارە خراپەکانیان پەشیمان دەبنەوە ، لە خودای سوبحان دەپاڕێنەوە بیانگێڕێتەوە سەر دنیا تاکوو عەمەلی ساڵح بکەن ،ئەم داوایان لێ قەبووڵ ناکرێ،هەر وەک خودا لە قورئاندا دەفەرمێ: " ئەو کاتەی کە مەرگ دەگاتە سەر یەکێکیان،دەڵێ خودایە بمگەڕێنەوە تا کارێکی باش بکەم ،وەڵامی دەدرێتەوە نابێ ، ئەمە قسەیە و دەیکا ، بەڵام لە دوای ئەواندا بەرزەخێک هەیە تا ئەو رۆژەی لە قیامەتدا راست دەکرێنەوە"(٢)

دووەم ، هەرچەند مومکینە کەسانێک هەر لە دنیادا سزا یا جەزای کردەوەی خۆیان ببیننەوە، بەڵام دنیای بەرتەنگ بۆ ئەوە نابێ سزا و جەزای هەموو کارێکی تێدا بدرێتەوە. ئەمەش شوێن و کاتێکی زۆر بەربڵاوتری پێ دەوێ ، جگە لەوەش دنیا کێڵگەیەکە تۆوی ئاخیرەتی تێدا دەچێندرێ ، ئاخیرەتیش تەنیا جێگای هەڵگرتنەوەی خەرمانە .مەبەست لە مانەوەی ئینسان لەسەر ئەم دنیایە تێکۆشان بۆ دۆزینەوەی ڕێگای کەماڵ و هەڵبژاردنی ئازادانەی ڕێگای حەقە ، ئەگەر ئاکامی هەر کارێکیش دەست بەجێ دەرکەوتبا ، بێگومان هیچ کەس نەیدەوێرا کارێکی خراپ بکا و کەسیش لە عەمەلی ساڵح خۆی نەدەبوارد لە ئاکامدا ڕێگای بە کەماڵ گەیشتن لە خەڵک دەبەسترا، کەوابێ ئاخرین حیسابی کردەوەی خەڵک تەنیا لە قیامەتدا دەکرێ ، کە لەو کاتەدا دەرگای عەمەل پێوە دەدرێ و دەرگای بەهەشت و جەهەننەم بۆ میوانەکانیان دەکرێتەوە .

٤ ـ هەر وەک عەمەلی ساڵح و کاری خراپ جەزا و

---

**( ٢ ) حتی اذا جاء احدهم الموت قال کلا انها کلمة هو قائلها و من ورائهم رب ارجعون لعلی اعمل صالحا ترکت ، برزخ الی یوم یبعثون** ـ سورهٔ مومنون ١٠٠/٢٣

سزایان بۆ دانراوە، چاری وایە بیر و باوەڕ و عەقیدەش حیسابی لەسەر دەکرێ، لە حەزرەتی پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێ دەگێڕنەوە کە فەرموویە: "نیەتی ئینسانی بەئیمان (کە وەک خەتێکی فیکری بناخەی کارە باشەکانیە) لە عەمەلی ئەو باشترە، بەڵام عەمەلی مونافیق و دوودین (کە لەژێر ناوی خێرخوازی و بەروالەت ئیسلامەتیدا بۆ ئازاردانی ئیسلام و موسڵمانان تێدەکۆشێ) لە نیەتەکەی خراپترە" (۳)

لە لایترەوە کافر و مونافیق بێئەوەی عەمەلێکی خراپیشیان کردبێ لەبەر بیروباوەڕی باتڵ و کفری دەروونی خۆیان بازخواستیان لێ دەکرێ. دەبێ بلێین: تەنیا بێ عەقیدەیی بەخودا یا باوەڕ بە قایل بوونی شەریک بۆ ئەو گەورەترین گوناهێکە کە نابەخشرێ. هیچ گوناهێکی وەک قەتڵ دزی، زینا و شوربی خومری ناگاتێ، خودای گەورە لە دوو جێگای قورئانی کەریمدا دەفەرمێ: "خودا گوناهی شیرک نابەخشێ،بەڵام هەرکەس جگە لەوەی لێ بخوازێ دەیبووورێ." (۴)

۵ ـ خودای سوبحان کە رەحمەتێکی دنیاگر و فەیزێکی بێسنووری هەیە، هەرکارێکی چاک لانی کەم دەچەندانە پاداش دەداتەوە بەڵام بۆ هەر گوناهێک کە شیاوی سزادان بێ تەنیا بەقەدەر گوناهەکە سزای بۆ دادەنێ، هەروەک لە قورئاندا دەفەرمێ: "هەرکەس کارێکی باش بکا دەچەندانە پاداشی هەیە و هەرکەس گوناهێک بکا تەنیا بەقەدەر گوناهەکە سزا دەدرێ و ئەوان لە لایەن خوداوە زوڵمیان لێ ناکرێ" (۵)

لە حەدیسێکدا لە پێغەمبەری ئیسلام (د ـ خ) گێڕدراوەتەوە کە دەفەرمێ: "خوداوەندی سوبحان فەرموویە: هەرکات عەبدی من بیەوێ کارێکی باش بکا، بەڵام پێی نەکرێ، من جەزایەکی بۆ دیاری دەکەم، ئەگەر بشیکا من لە دەوە تا حەوتسەد چاکەی بۆ دەنووسم، هەرکاتێک بۆ کارێکی خراپ تەما بگرێ و نەیکا، گوناهێکی بۆ نانووسم، ئەگەر کردیشی، تەنیا گوناهێکی لەسەر دەنووسم" (۶)

**مەعاد لە چ زەمانێکدایە؟**

ئێمە کاتی مەعادمان بە دروستی لێ روون نییە، چونکوو ئاگاداری لەزەمانی قیامەت لە ئەسراری غەیبی خودایە، هەر وەک بۆ خۆی لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرمێ: "**ان الله عنده علم الساعه**"، زانستی قیامەت تەنیا لەلای خودایە (۷)

ئەڵبەت ئەمەش بەو مانا نیە کە کەسێک جگە لە خودای تەبارەک و تەعالا نەتوانێ ـ تەنانەت بە هیدایەتی خودایش ـ لە زەمان و ئەسراری قیامەت بگا، چونکوو ئاگادار بوون لە شتی وا زانستێکی بێسنوور وەک زانستی

---

(۳) **نیه‌المومن خیر من عمله و عمل المنافق شر من نیه**ـ نهج الفصاحه/ص ۶۳۴ شماره /۳۱۴۲

(۴) **ان الله لایغفر ان یشرک به و یغفر مادون ذلک لمن یشاء**ـ سوره نساء/۴/ آیه‌های ۴۸ و ۱۱۶

(۵) **من جاء بالحسنه فله عشر امثالها و من جاء بالسیئه فلایجزی الا مثلها و هم لایظلمون**ـ سوره انعام/۶/۱۶۰

(۶) **اذا هم عبدی بحسنه و لم یعلمها کتبتها له حسنه فان عملها کتبتها له عشر حسنات الی سبع مئه ضعف، واذا هم بسیئه و لم یعلمها لم اکتبها علیه فان عملها کتبتها علیه سیئه واحده**ـ نهج الفصاحه ص ۴۳۹/ شماره ۲۰۶۸

(۷) سوره لقمان ۳۴/۳۱

خودای ناویٚ ، کە دەستی
ئینسانی کامڵ و
بەئیمانیشی نەگاتیٚ،بەڵکوو
عەبدی ساڵحی خودا لە
نەتیجەی بڕوا و عەمەلی
ساڵحی خۆیەوە دەتوانیٚ بەو
پلە لە زانست و ئاگاداری
بگا کە بەسەرهاتی دوای
مەرگی ئینسان بە وردی
بزانیٚ و بەشیٚکی بۆ خەڵک
بگیڕیٚتەوە .

خوای مەزن لە
قورئاندا دەفەرمیٚ : .....
ئەو خودای کە غەیب زانە
کەوایە هیچ کەس لە
نهیٚنییە غەیبییەکانی خۆی
شارەزا ناکا مەگەر ئەو
رەسوولانەی کە لیٚیان رازی
بیٚ " ( ٨ )

کەوابیٚ دەتوانین بلیٚین
کە پیٚغەمبەری مەزنی خودا
( د ـ خ ) و ئەو کەسانەی
لیٚی نزیک بن لە زەمانی
کارەساتی قیامەت و
بەسەرهاتی دوای مەرگ
ئاگادار بوون ، بەلاّم لە
هەموو قورئان و
ریوایاتی ئیسلامیدا زەمانیٚکی
دیاری کراو بۆ ئەم
کارەساتە نیشان نەدراوە ،
هەر بۆیەش :

یەکەم ـ بە سەلاّحی
ئینسانە کە بۆ ئەوەی
بەرەو تەکامول هان بدریٚ و
چاوەڕوانی حیساب و جەزا و
سزا بمیٚنیٚتەوە ، ئەم
واقیعیەتە تا رادەیەک
لە باری زەمان و هیٚندیٚک
تایبەتی دیکەوە لەبن
سەرپۆشدابیٚ و بشاردریٚتەوە .

دووەم ـ ئەگەر ریٚبەرە
ئاسمانییەکانیش وایان
راگەیاندبا ، ئینسانی ئاسایی
نەیدەتوانی لە حەقیقەتیٚکی
واگەورە بگا ، هەر وەک
ئەگەر پیٚغەمبەری مەزن
ژماردی ئەتۆمەکانی جیهانمان
پیٚ بلیٚ سەرمان سوڕ دەمیٚنیٚ
و بیٚگومان بیری تەسکی
ئیٚمە لەبەر بارگرانی
زانستیٚکی وادا خۆ ڕاناگریٚ.

بەلیٚ ئەوەی راستە
ئەوەیە کە زەمانی قیامەت
لە دوای کووژانەوەی چرای
تەمەنی دنیایە ، کە
مەخلووقاتی ئەم جیهانە
گەیشتبنە ئاخری ئەو خەتەی
کە لەسەر ئەم دنیایە
بۆیان دیاری کراوە و بۆ
گواستنەوە لەم قۆناخەوە
بۆ جیهانیٚکی دیکە ئامادە
بوون .

**مەعاد لە دینە ئاسمانییەکانی دیکەدا :**

چاو خشاندنیٚک لە
میٚژووی دینە ئاسمانییە ـ
کاندا ئەم حەقیقەتە
گەورەمان نیشان دەدا کە
ئینسان لە دوای مردن
هەنگاو دەنیٚتە دنیایەکی
بەرینترەوە کە ئاخیرەتە .
هەر پیٚغەمبەریٚک هاتووە و
خەڵکی بەرەو خودای حەق
دەعوەت کردووە ، لە دوای
ئەم بانگەوازە ئەوانی لە
عەزابی جەهەننەم ترساندووە
و مزگیٚنی نیعمەتی بەهەشتی
هەتا هەتایی داویٚ ، لە
قورئانی پیرۆزدا هیٚندیٚک
لەو بابەتانە باس کراوە:

**الف ـ** لە بەسەرهاتی
حەزرەتی عیسا ( س ـ خ )
لە قورئاندا هاتووە کە
ئەو حەزرەتە هیٚشتا لە
لانکدا بووە، دوای دان[illegible]نان
بە وجوودی خودا و ئیشارە
بە پیٚغەمبەری خۆی دەڵیٚ:
" سلاو و رەحمەتی خودام لیٚ
بیٚ لەو رۆژانەدا کە لە
دایک بووم و ئەو رۆژەی کە
دەمرم و ئەو رۆژەی کە
زیندوو دەبمەوە و سەر لە
خاک هەڵدیٚنمەوە ." ( ٩ )

**ب ـ** ساحیر و جادووگەرە ـ
کانی فیرعەونی میسر
دوای ئیمان هیٚنان بە
حەزرەتی مووسا ( س ـخ ) لە
بەرانبەر هەڕەشە و گورەشەی
فیرعەوندا پاش وەلاّمدانەوە
پیٚیان گوت : " بۆ ئەو
کەسانەی کە بە باری گوناە
و تاوانەوە دەچنە بارەگای
خوداوەند جەهەننەمیٚک هەیە
کە نە مەرگی تیٚدایە (چونکوو
عەزابیٚکی هەتا هەتاییە )

---

( ٨ ) عالم الغیب فلا یظهر علی غیبه احد الا من ارتضی من رسول ...سورهٔ جن ٢٦/٧٢

( ٩ ) والسلام علی یوم ولدت و یوم اموت و یوم ابعث حیا ـ سورهٔ جن ٢٦/٧٢

و نه ژیانی تێدایه ( چونکوو عەزاب هێند زۆره ئاسایش و حەسانەوەیان نیه و بەدایم دەڵێی لە مردندان) .هەرکەس بە ئیمان و عەمەلی ساڵحەوه بەرەو خودا بڕوا دەرەجاتی عالیەی دەدرێتێ و بەهەشتی هەتا هەتایی که رووباری تێدا جاریه و ئەمەیه جەزای ئەوانەی که خۆیان لە گوناه خاوێن دەکەونەوه ( ١٠ )

ج ـ حەزرەتی یوسف(س ـ خ ) بۆ شوکرانه بژێری له نیعمەتەکانی خوداوەند عەرزی باریتەعالای کرد " خودایه ، تۆ پادشاهیت داومێ تەئویلی ئەحادیس ( ئەو زانستانەی که خەڵکی ئاسایی لێی بێبەشن)ت فێر کردووم ، ئەی خوڵقێنەری ئاسمانان و زەوی تۆ ساحیب ئیختیاری منی له دنیا و ئاخیرەتدا ، به موسلیم بمرێنه و لە ڕیزی ساڵحانم دابنێ " ( ١١ )

د ـ حەزرەتی نووح(س ـ خ ) به قەومی خۆی گوت : " خودای سوبحان ئێوەی لەسەر زەوی خوڵقاند ، دوایەش ئێوه دەگێڕێتەوه بۆ زەوی ، یانی دەتانمرێنێ ، وله قیامەتدا حەشرتان دەکا " ( ١٢ )

جگه له پێڕەوانی دینه ئاسمانیەکان کۆمەڵانی دیکەی ئینسانیش به چەشنێک باوەڕیان به هەبوونی جیهانی دوای مەرگ بووه ، وەک فیرعەونەکانی میسری کۆن ، که دەمرن پاشماوەکانیان زێر و جەواهیراتێکی زۆریان لەگەڵ دەنانه قەبر تا له جیهانی دیکەدا کەلکیان لێ وەربگرن

**ئیسلام و مەعاد**

باوەڕ به مەعاد یەکێک له بناغه گرینگەکانی دینی ئیسلام و به یەکێک له ئوسوولی بنەڕەتی دینی ئیسلام دەژمێردرێ ، هەرکەس باوەڕی پێی نیه موسڵمان نیه وله ئەحکامی موسڵمانان وەک ئیجازەی ژنی موسڵمان هێنان ، میرات گرتن له موسڵمان و تەهارەتی بەدەن و ... بێبەش دەبێ .

تا ئەو جێگایەی که نووسەری ئەم مەقالەیه لێکی داوەتەوه له بیست و هەشت جێگای قورئانی مەجیددا دوای باس لە ئیمان به خودا دەست بەجێ باسی ئیمان به ڕۆژی قیامەت کراوه .که زوربەی نزیک به تەواویان له زمانی خودا تەعالاوه گوتراوه و باقیەکەی له زمانی کەسانی دیکەوه که به شێوەیەک گرینگی قیامەت دەگەیەنێ ، دوو نموونه دێنینەوه .

**١ ـ لیس البر ....**

چاکه ئەوه نیه که رووی خۆت بەرەو شەرق و غەرب وەرگێڕی ، بەڵام چاکه ئەوەیه که کەسێک ئیمان بێنێ به خودا و ڕۆژی قیامەت و مەلائیکه و کتێبی خودا و پێغەمبەران و .... ( ١٣ )

٢ ـ خوداوەندی تەعالا له قورئانی کەریمدا له زمانی حەزرەتی یوسف ( س ـ خ )ەوه دەگێڕێتەوه که له زینداندا به هاوبەندەکانی خۆی دەگوت " **انی ترکت .....** " من وازم له ئایینی ئەو کەسانه هێناوه که به خودا ئیمان ناهێنن و به ڕۆژی قیامەت بێباوەڕن . ( ١٤ )

---

( ١٠ ) انه من یات ربه مجرما فان له جهنم لایموت فیها و لایحیی ، و من یاته مومنا قد عمل الصالحات فاولئک لهم الدرجات العلی ، جنات عدن تجری من تحتها الانهار خالدین فیها و ذالک جزاء من تزکی . سورهٔ مریم ٣٢/١٩

( ١١ ) رب قد اتیتنی من الملک و علمتنی من تاویل الاحادیث فاطرالسماوات والارض انت ولیی فیالدنیا والاخره توفنی مسلما والحقنی بالصالحین . سورهٔ یوسف ١٠١/١٢

( ١٢ ) والله انبتکم من الارض نباتا ثم یعیدکم فیها و یخرجکم اخراجا .سورهٔ نوح ١٧/٧١

( ١٣ ) سورهٔ بقره ١٧٧/٢/

( ١٤ ) سورهٔ یوسف ٣٧/١٢

حاجی ڕەئوفی سەلیمی :

# مامەڕەحەی سونج وکەلیخانی بانە

(ڕەحە) کورت‌کراوەی (ڕەحیمە) و سونج ناوی دێیەکە لە داوێنی کێوی کەلی خانی بانە لە زنجیرە کێوەکانی زاگرۆس . کورت کردنەوەی ناوی ڕەعیەتەکان دابێکی سەردەمی دەرەبەگایەتی بوو کە دەیانویست بەوجۆرە سووکیان بکەن و جاری وابوو ناوی ناخۆشیان لێ دەنان وەکوو (عەبەگڕوێ) (خلەمەشکە) و هەروەها ناوی ناخۆشتر . مامەڕەحەی سونج هەرچەند حەفتا ساڵ تەمەنی بوو ناچار بوو کارێک کە لە لاوەتیدا هەڵی بژاردبوو درێژەی پێبدا. لە داستانە ئەفسانەیی‌یەکانی کێوی (هیمالیا) و ترۆپکی ئێوێرستدا ، بیستوومانە کە پیاوی بەفرینە هەیە و فیلمیشیان لەم داستانانە دروست‌کردوون . بەڵام مامەڕەحەی سونج پیاوە بەفرینەی ڕاستەقینەی کەلی خان بووە،وەکوو فریشتەی غەیبی بەهانای کاروانی‌یەکانی زستانەوە دەچوو و فریایان دەکەوت . هەموو ڕۆژێک کاڵەو پووزەوانەی هەڵدەکێشاو بەرەو کێو دەچوو .

ریشی مامەڕەحە وەکوو بەفری کەلی خان سپی بوو ، هەمیشە یەخەی ئاوەڵا و مووی سپی سنگی کەلەکەوا مرادخانی‌یەکەیەوە هاتبووە دەرەوە تێک هاڵابوو. جاری وابوو چلوورە سەهۆڵ بەریش و سمێڵ و سنگیدا بەر دەبۆوە. گۆچانێکی زل و ئەستووری پێ بوو و لەپێش‌کاروانی‌یەکانەوە دەڕۆیی.لە ناو تەم ومژی کێوی کەلیخاندا ڕێگای ون نەدەکرد . شارەزای هەموو کەلێن و قوژبنی ئەم کێوە بوو ،چونکە لە منداڵی‌یەوە تا بەم عومرە گەیشتبووهەزاران جار بەم کێوەدا هاتوچۆی کردبوو و ڕێگاوبارنەکانی دەناسی .

ڕێبوارێک کە نەیدەتوانی بڕوا ، لەکۆڵی دەکرد .

ئەگەر ولاخێکیش لەپێ دەکەوت بارەکەی بەکۆڵ دێناوە و گوریسێکی لە لاقی ولاخەکە دەبەستووڕای دەکێشا بۆ نێو دێ . لێیان دەپرسی بۆچی ولاخەکە بەجێ نایەڵی خۆ تۆپیوە؟ مامەڕەحە لەوەڵامدا دەیگوت : (کاری خۆم ناتەواو ناکەم . سەگی سونج بێ‌گۆشت ناکەم) .مامەڕەحە زۆربەهێزو تەکان بوو . پاڵەوانێک بوو وەکوو ڕوستەم ڕەنگە ئەوهێزو تەکانەی لەباوو باپیرەوە بەمیرات بۆ بەجێ مابێ .

یەکێک لە باپیرەکانی مامەڕەحە ناوی "موترزا"بووە موترزا هەر دووچاوی کوێر بووە . کاری هەر تەنەکە لێدان بووە تا ورچ گوێزەکانیان نەخوا و بەراز هەرزنەکەیان نەکێڵێتەوە . جارێک ورچێک دێ بۆ گوێز خواردن موترزا بە کوێریە زۆرەوانی لەگەڵ دەگرێ.بەدار گوێزە کەوە دەیکوشێ تا دەیکووژێ .

مامەڕەحە لە ساڵەکانی ١٢٨٠ تا ١٣٣٠ی هەتاوی کە جادەی ماشێن لە بەینی شارەکانی بانە و سەقز

تەکێشرابوو هەر بەم کارەوە خەریک بوو و مایەی ئومێدی کاروانی‌یەکان لە زستانداهەر مامەڕەحە بوو .

کاروانی یەکان نان و خورما و کەمێک پارەیان دەدا بە مامەڕەحە و ژیانی ئەمرونەژی خۆی و منداڵەکانی لەو ڕێگایەوە دابین دەکرد ،بەڵام لە دوای ئەوساڵانە ماشێن و بۆلدزێر جێگای مامەڕەحەیان گرتەوە و مامەڕەحەو کاروانی یەکان بێکار بوون .

ژیان و بەسەرهاتی ئەم پیاوە پاڵەوانە دەبێ بکرێ بە فیلم و کتێب و داستان و ئەو هونەرمەندانە کە دەیانەوێ ژیانی زەحمەت کێشانی کۆمەڵ بخەنەبەرچاو فەرموون بێن بینووسن لە بارەی وڵاتەکەی خۆیانەوە چونکوو بەڕاستی ئەم بەسەر هاتەوەک فیلمی (شمال بزرگ) و بەسەرهاتی (اسکیمو) و (جویندگان طلا) و (سپید دندان)نووسراوەی(جک لندن) سەرنج ڕاکێشە . ئەم بەسەرهاتە لەلایەکی تریشەوە سەرگوزەشتی کاروانی و قەتارچی‌یە زەحمەتکێشەکانە کەلەزستانی سارددا نەیان- هێشتووە شارەکەیان بێ کەل و پەل و خواردەمەنی بێ و لەشارەکانی هەمەدان و زەنگانەوە شتیان هێناوە بۆ بانە . جاری وابووە مانگێک لەڕێگەدا بوون . دەنگی‌زەنگی قەتار کەلەشار نزیک دەبۆوە خەڵکی دەچوونە بەخێرهاتنیان. هەر ئەم کاروانی‌یانە بوون کەلەشەڕی دووهەمی جیهانیدا وەختێک شاری بانە هەمووی بە دەستی دەرەبەگەکان سووتا کەل و پەلی خەڵکی شاریان دەبردە درەوە چونکوو ئەو وەختە خەڵک هەژار بوون و هەموو ماڵەکەیان باری وڵاخێک بوو .

شاری بانە لە شەڕی یەکەمی جیهانیدا بەدەستی رووسەکان سووتا و لە شەڕی داسەپاوی عێراق بەسەر ئێرانیشدا تائێستا سێجار بۆمباران کراوە و هەر بۆیەش دەڵێن : ( بانە سووتاو ) یا ( بانە کلۆڵ ) .

لەچەند جێگای کێوی، کەلیخان قاوەخانە بۆ حەسانەوەی کاروانی‌یەکان دروستکرابوو وەکووقاوەخانەی شاعەبباسی کەلەبەرد و خشتی سوور وقسڵ بوو سەرەکەی گومبەزی و درگاکەی کەوانی بوو رووسەکانیش بۆسەربازەکانیان جادە ماشێنێکی باریک ولێژیان دروستکردبوو بەلای کانی رووسیدادەهاتە خوار . بەڵام ئێستاهەموویان خاپوور بوون لەکاتی نووسینی ئەم بەسەر هاتە لەکێوی کەلیخان تونێل لێ دەدرێ و بڕیارایە جادەی بەینی بانەو سەقز ئیسفالت بکرێ بەڵام تائێستا تەواو نەبووە وئەم کارە وەکوو تەلیسمی لێهاتووە وهەر دوایی نایە خەڵک لەهاویندا لەبەرتەپ و تۆز و لەزستاندا لەبەر قوڕو چڵپاو زۆر ناڕەحەتن .

# رەخنەو پێشنیار لەسەر باس و لێکۆڵینەوە ئەدەبی یەکان

پێشەکی یەک بۆ ئەم زنجیرە باسە

ئەوەی لێرە دەیبینن رەخنە و پێشنیاری ماموستایانی خاوەن ڕا و هەموو خوێنەرە بەڕێزەکانی سروە لەسەر باسە زانستی یەکانی ئەدەبی کوردییە. خوا یار بێ لەم جێگای گۆوارەکەماندا جار لەگەڵ جار نەزەر و رەخنە و پێشنیاری هەموو خوێنەرانی سروە رادەگەیەنین و دەیانخەینە بەرچاوی خوێنەران. بەڵام پێویستی بە روون کردنەوەیە کە دەقی نووسراوەکان بەبێ هیچ چەشنە دەست تێوەردان و تەنانەت بەبێ راستکردنەوەی هەڵە ئاسایی یەکان (وەک دانانی نیشانەی "ٚ" و "ـ" و "ٚ" و هەڵەی ئیملایی و...) چاپ دەکەین، کەوابێ تکا دەکەین کە رەخنەمان بۆ دەنێرن خۆتان چاوێکی دیکەی پێدا بخشێننەوە و بەبێ هەڵە بۆمانی بنێرن، هەروەها ئەوەش دەبێ بلێین لەگەڵ رێزدانان بۆ نەزەر و رەخنە و پێشنیاری خوێنەرانی خوشەویستمان، هەروەک پێشتر رامانگەیاندووە بۆ ئەوەی لەو نەزمەی گرتوومانە بەر، لانەدەین هەرچەند بەشێکی زۆر لەو پێشنیارانەشمان قەبووڵ بێ هەتا پەسند کردنی رێبازێکی دیاری کراو لە لایەن کۆڕ و کۆنگرەیەکی ئەدەبی یەوە، لەبەر چاویان ناگرین و تەنیا بو ئاگادار بوونی خوێنەرانی دیکە بڵاویان دەکەینەوە.

هیوادارین لە داهاتوودا تێکرای ئەم باسانە و رەخنەی خوێنەران بە شێوەی کتێبێکی سەربەخۆ بڵاو بکەینەوە و دەمەتەقەیەکی ئەدەبی بکێشینە نێو کۆمەڵ و مەیدان بۆ پێک هێنانی کۆنگرەی ئەدەبی ئامادە بکەین، لەو کۆنگرەدایە کە گیر و گرفتەکانی ئێستاي زمانی کوردی چارەسەر دەکرێ. انشاء الله

## رەخنەی
## کاک قادری فەتاحی قازی

بەڕێوەبەرانی بەڕێزوهێژای گۆواری سروە

لەپاش سڵاو، دیسانەکە چاوم بە دیتنی سروە ڕون بۆوە، ئەوەی کەنامەکەی پێشوی من تان لە دو جێ (ل ١١، ل٤٩) مونعەکیس کردووە، سپاسو دەکەم، ئەو سەفەرەش دەمەوەێ نوکتەیەکی ڕێ زمانی یاداوەڕی پکەم، ئومێدەوارم بە چاپی بگەیەنن.

لە لاپەرەی **٨٦**،ژمارە **٢** داهاتووە :

بەڵام ئەگەر بنوسین( واوێکی بەسە،هەروەک یەیەکی بەسە)[1]"**ئەو کتێبەی بە عەلیدا ناردەوە** "دروستە، چونکو لێرەدا "**دا** "فیعلی سێهەم شەخس و وشەیەکی جیاواز نییە و پاشگرە.

ئەگەر لەباتی واژەی **عەلی** کە دە جەوهەری خۆی دا **یەی** هەیە، واژەی خۆماڵی "**مامەند**"یا **ڕۆستەم**یا "**گوڵان**" بێنین( لە دەستوری زماندا وا باشە واژەی خۆماڵی دەکار کرێ) جوملەکە (ڕستەکە) ئاوای لێ دێ :

**ئەو کتێبەی بە مامەندی دا ناردەوە**

**ئەو = = ڕۆستەمی دا =**

**ئەو = = گوڵانێ دا =**

١ ـ ئەوە قسەی خۆمە .

"دا"که بە پاشگر ناساندراوە پاشماوەی حەرفی ئیزافەی "بە"یە ،یانی حەرفە ئیزافەکەی مە تەنیا "بە"نییە، بەلکە "بە... دا"یە، حەرفە ئیزافەیەکی دولک و دو بەشە، بەشێکی "بە"یە، بەشێکی "دا: بە دا

**حەرفی ئیزافە**

ئەم دو بەشە ناوەکە دەگرنە نێوان خۆیان بە ناوەکە دەڵێن :**مەفعولی غەیرە سەریح.** مامەند یا ڕۆستەم یا گوڵان مەفعولی غەیرە سەریحن .ناوەکە ئەگەر ناوی نێرینان بێ، "ی"بە دووادا دێ ئەگەر ئی مێیینان بێ "ێ" دەگرێ . کە وابو **دا** دولیلێکی نییە کە بە ناوەکەوە بنوسێ ، بە جۆ بنوسرێ باشە ،بەلام **بە**یەکان دەبێ بە **ناوە**کانەوە بنوسێن، بەو مەرجە حەرفی ئاخری ناوەکان لەو حەرفانە نەبن کە بە پیتی دووای خۆیانەوە نانوسێن وەک پیتی د، ز، ژ، ر، و، ...

---

# «رەخنەی» کاک سەیدکازمی ژارابادی

بو برایانی بەریز و زەحمەتکیش دەستەی نویسەرانی گوواری (سروە) پاش ریز وسلاویکی گەرم ، بەبونەی پاشکەوتنی کاغەزەکەم داوای لیبوردنتان لی ئەکەم و بەهوی دەرچونی ئەولین ژمارەی سروە لە چاپ پیروز باییتان لی ئەکەم و لە خوای گەورە داوای سەرکەوتنتان ئەکەم ، پیش هەموشتیک ئەبی بلیم کە ئەوە بە بەرەکەتی ئیسلام و کوماری ئیسلامیە کە ئەم هەلو مەرجەی بو پیک هیناوین کە بتوانین پیگاویکی موسبەت بو فەرهەنگی چەوساوەی گەلەمان هەلبگرین و بتوانین بە زبانی زکماکی خومان بنویسین .

١ - لەبارەی رینویسەکەتان - ئەبی بلیم کە رینویسەکە زور جوان وریک و پیکە بەلام خەتەکەی زور بەرچاف نیە ئەگەر مومکن بیت خەتەکەی باشتر و جوان تر بکەن .

٢ - لەبارەی ئەمە کە گووارەکە تەنیا بە لەهجەی کوردی خارو یانی(سورانیە) رخنەم هەیە ، هەروەک هەمومان ئەزانین تا ئیستا گەلی چەوساوەی کورد لەهەمو ناوچەکان دا بەتایبەت لە تورکیادا تەپەسەر کراوە و نەیتوانیوە بەم جورەی کە پیویستە بەهرە لە فەرهەنگ و ئەدبیاتی خو وەربگریت ئیستا هەر وەک لەسەرەوەش ئیشارەم پیکردوە بە بەرەکەتی ئیسلامە کە ئەتوانین بەهرەی لی وەربگرین ، ئەگەر بیتو ئیمە ئەکسەریەتی کورد بگرینە بەر چاف تورکیا بەئەندازەی هەمو ولاتەکانی تر کوردی تیائەژی وحکومەتی تورکیا حەتا ئعتراف بە کوردیەتیان ناکات، ئەگەر ئنسان لەلای قەومیکی بیگانە بکەویتە بەر زولم و زور پی نارحەت نیە بەلام ئەگەر برای هاوال جمکی ئینسان زولم لە مروف بکات مروف زور پی ناراحەت ئەبی، لەبەر ئەمە دەبوا لای کیم سی لاپەر بە لەهجەی کوردی ژورو بوایە هیوادارم کە ئەم رەخنەیەم نەبیتە جیگای ناراحەتی ئیوەی خوشەویست چونکە لە کونەوە لەهجەی بادینی فەرهەنگ و ئەدەبیاتیکی گرنگی هەبوە .

٣ - لەباری تیبنی ٣ کە لەبارەی بەکار بردنی پیتەکانی(ص وط)یە من بەنەزەری خوم لاگری بیرورای ماموستا زەبیحیم چونکە لە لەهجەی بادینی دا هینک کەلیمە هەن کە مەعنای جاوازیان هەیە و لەنویسیندا وەک یبک دەنویسرین وەک صەد (١٠٠) ویان سەد (ئاوبەند) و زور شتیتر لە دوایی کاغەزەکەمدا لە ئیوە برایانی بەریز داوا ئەکەم ئەگەر کەم و کوریک لەنویسەکە و لەهجەکەم دا بەر چاف بکەوی ببورن.

ئیتر هیوادارم سەرکەوتوبن .

١ ـ سەبارەت بەم پارچە شیعرەی خـــوارەوەی مەولەوی :

**مەیلت ئارەزووی ئەغیار کـــەردەبـــێ**
**چیش؟خامەکەت نام مەعدووم بەردەبێ**
**بێ منەت جەمەیل ئامای نامـــەتـم**
**مەمنوون جەوەفای رەشحەی خامـــەتـم**
**پەرسا بیت چۆنی ؟ ویت غەڵەت کەردەن**
**مەرنمەزانی دووریــــت چ دەردەن؟**
**گەرمی بڵێسەی دەروون دەمـــاخ**
**دێوە لوول ئاخ دڵەی پڕجە داخ**
**ئەو بەردنم نەچەم دیدەی پڕجەدەرد**
**ئێد مالا رووی حەرف خەیاڵ بێگەرد**
**نە قەترەی ئەسرین مەندەن نەچەمدا**
**نە نوختە ، نە حەرف ،ئینشای ماتەمدا**
**عەرزە شاهەدەن خاس بدیە پێشـــدا**
**حەرف نوختەدار نەمەندەن تێشـــدا**

لەبیرم دێ ئەم پارچە شـــیعرەیـــــان دەخوێندەوە تا دەگەیشتنە دوابەیتەکـــەی ئەنجا بۆ لێک دانەوەی دادەمان. چوونکـــوو ئەگەر مەبەست بە (عەرضە) شیعرەکەیەخۆ پڕە لە حەرفی نوختەدار، تەنانەت خوالێ خۆشبووی کاکم ( وجیه الدّینی هاشمی ) کە مامۆستای لێک دانەوەی شیعری مەولەوی بوو چەند مانای ناسک و جوانی بۆداتاشی و، بەهیچ کاملەوانە دڵنیا نەبوو .

ئەم گرێ کوێرە بەنینۆکی کەس شی نەکرایەوە تاساڵی ١٣١٢ی هەتاوی ئەوحەلە با وەکوونێ ئاوە زانێکی واشم نەبوو، بەڵام بەرێبـەری یەکێک لە خزمانم تێکۆشام بۆبەدەس هێنانـی (کلّیات)ی مەولەوی . لەماڵی یەکێک لـــە بەگزادەکانی باوەجانیدا کە خۆی زیندانـــی بوو شکم دەبرد.چەندساڵ لەوەپێش تاریفیئەو (کلّیات )ەم لە وبەگەزیندانی یە بیستبــوو . سەر ئەنجام (کلّیات )ی باس کراوم بەدەس هێنا کەبەخەتی (سدیعبدالله) کـــوورەزای مەولەوی نووسرابۆوە . بەڵام وەکووبەختەکەی مەولەوی نەکبای نەگبەت هەرپەرە یەکیخستبووە سەردیارو هەردە و دوڵێک وبەشێکی زۆرکـــەی مابوو . هەر چۆنێک بوو چەند پارچە شیعر و چەند نامەم لێ پێک هێنا کە یەکێک لەونامانە نامەبێ نوختەکەی مەولەوی بوو کە بەم نامە وبەم پارچە شیعرە سەرەخۆشی لە حەمەپاشـای جاف کردووە .

ئەوابۆ ئەوەی دەستەڵاتی مەولەویمان بـــە خوێنەرانی خۆشەویستی سروە راگەیاندبێ نامە

## سەیدتاهیری هاشمی :

# دەسەلاتی مەولەوی لەئەدەبیاتدا

بێ نوختە کە بەتەواوی لێرە دێنینەوە .

دیارە مەولەوی بۆ نووسینی ئەم نامەیـە خۆی سەخڵەت نەکردووەو کتێب لوغەتـــــی دانەناوە کە بەشوێن وشەی بێ نوختەدابگەڕێ و هەروەک کاغەزە نوختەدارەکانی ئەمەشـــی بەرەوانی وجوانی هێناوە .

٢ ـ (معمّاسازی ) مەولەوی . مەولەوی لەم دووشیعرەیدا کەبۆخالووها وفەردی خۆشەویستی خۆی ئەحمەد بەگی کۆماسی نووسیوە (معمّا ) یەکی بەناوی (احمد) داناوە بەڵام جەنابی مامۆستا مەلاکەریم لە شەرحی دیوانی مەولەویــــــدا ئیشارەی بەمە نەکردووە .

**یار وەفادارشەرت و بەین بێ شـۆ**
**چون نووردیدەی مەعدوومـی مەبـۆ**
**وەختێ بەندەی وێش بەی حاڵ وچەمدی**
**ئەسرین (وەچمدا[1]) رێزا و پەشێوبـی**

ئەسرین ، واتە فرمێسک بەوشەی (چـــمدا ) دارژاندن دەبێ بەهۆی ئەوە کەنوختەکانـــی لاچێ و ببێ بە (حمدا ) وپەشێو بوونیشی دەبێ بەهۆی ئەوە کە ئەلفەکەی ئاخری بکەوێتـــە ئەوەڵـەوەو (احمد)ی لێ بەدەس بێ .

(١) "چمدا" بەرێنووسی ئێستابەشێوەی "چەمدا" دەنووسرێ .

مستند عرایض نامه بدون نقطه مولوی را عیناً بخط ایشان در مجله محبوب دسروه کلیشه گردیده که از تبرک حروف چنان محفوظ

اسم الله العال   اوّل هر کلام که صدور اهل کمال در سطور آرد و اکمل و اصح هر طور املح و هر
سحر حلال که کلک در رسالک گهر رسوم معدوم محروم محرّر و مسطور دارد حمد و مدح هر حامد
و هر مادح در گروه هر مسلم و در رهط هر ملحد و کادح گردد و در گرو ورد همه اعصار و دهور
مرد درگاه عالم آرام آگاه لا اله الا الله را ، و درود لامعدود و سلام لامحصور لامحدود عدد
کل داء و دواء مادام السماک والسماک والسماء مرسل الارسال ممدود و سردار محل محمود و کار آگاه
در علوم همه علماء آگاه محمد رسول الله را ، و مر آل اعلام و اولاد اطهار الاسرار احرار را ، و سائر
اهل اسلام و گروه صوالح الاطوار را ، حمد الله عالم حاصل و درود و سلام رسول اکرم کامل آمد
در سول کالوصول را آماده کرده و طرح اهل وداد را در دل آورده همراه آه دل مکدر در هر سا
و هر سحر سرکار مکرم و سردار اکرم و اولو الامر مکارم و مراحم همه مر را ادام الله عمره و عمر اولاد
الکرام طوعاً و روحاً مرسل رسائل دعا و سلام ، معلوم سرکار آمده که اولاد آدم و حوا
و لد داود آسا اگر همه عالم کالهواء محکوم حکم و رام امر او گردد محل او گور و همراه او مور گردد ،
عمر عمرو و سر و عمر همه کس صرصر عدم وار ره مرگ در راه دارد ، و حاصل و محصول دوام
هر احد را داس اعدام ممالک ملک ارواح در درو آرد ، مرد راه هر ادل در گرو وداد
راه آورد اعمال صوالح آمد ، حالا که همه روح لا عمل صلحاء در کار دارد که لو راح الروح
و صار آدم کالکروه المطروح لا طمع لعامل السوء الاسوء الدار ارحم همه رحما و اکرم همه کرما
مرده ها را هم در دار السلام هم سر سور و سرور و حور و سرکار کرم مدار و اهل و اولاد و اکام و ا
و دائماً در الاء سرمد و مدد هم اهل الله محروس و مسلم و مسرور و اعداء او را در آلام ،
اصل همه کارها و اساس کل ما مأمول و مرام الدعاء لکم و لاولادکم مادام الروح و وسعه الحال و السلام
و الاکرام   ولد آل الروح المعدوم الملول

پشت پاکت

هو الموصل لکل موصول مرسول رسول معدوم ملول مطمح ادراک سرکار آرام مکرم همه اسم محمد اکرم صلی اللهم له وسلم مادام العالم گردد

چاکم لەبیرە :

لەنێو ماشێندا دانیشتبووم و چاوم لە چیا و شیو و دۆڵەکانی خۆمان بڕیبوو. بە دیتنی ئەم هەموو سەوزەزار و گوڵ و گیایە ، دڵم دەپشکووت، دەمگوت :

ـ بریا ماڵمان لێرە بایە و بۆخۆم لەنێو ئەم شێوەرد و سەوزەزارەدا گاڵتەم کردبا .

خەیاڵ هەڵیگرتبووم و لەگەڵ خۆی دەیبردم بۆ لای خۆشترین کاتەکانی ژیانی پێشووم ، لەپڕ تێمڕاخوڕین و پێ یان گوتم :

ـ دە وەرە خوار، ئەوە هۆشت لە کوێیە ؟

کە چاوم هەڵێنا لەنێو ماشێنەکەدا کەس نەمابوو ، هەر کاکم بوو کە دەیگوت :

ـ وەرە ڕۆژ درەنگە ناگەینێ !

لە ماشێنەکە دابەزیم دەگەڵ دیمەنی شارێکی نەناس و نائاشنا بەرەو ڕوو بووم و بۆنێکی جیاواز لە بۆنی مدڵبەندی خۆمان بەبەر لووتمدا هات ، بە دیتنی ئەو هەموو ماشێنە کە تا ئێستا نەمدیبوو یەک بە خۆم قیژاندم و گوتم :

ـ ئای لەو هەموو ماشێنە چەند زۆرە خودایە گیان»

ئێستا قسەکەم بە تەواوی نەکردبوو کە شەقەزللەیەک لە بنان گوێم درا ، لایەکی دەم و چاومی تەزاند و سووری هەڵگێڕا ، دەستێکم بە گوێم گرتبوو دەستەکەی دیکەشیان رادەکێشام ، تاکوو لەسەر سەندەڵییەکی لە عەرزیان کوتام .

ئەگەر سەرم هەڵێنا ساڵۆنێکی گەورە و کاشیکراو و خاوێن کەپڕ لە میز و سەندەڵی بوو، لەپێش چاوم بوو، چەند مشتەری دەهاتن و دەچوون ، دوو سێ کەسیش کە کراسێکی درێژیان لەبەر دابوو هەرجارە روویان لە جێگایەک دەکرد ، هەر جارە چێشتێکیان لەسەر دەستی بوو ، هەرچەندی بە پەنا مدا دەهاتن و دەڕۆیشتن بۆنی چێشتەکەی سەر دەستیان مەستی دەکردم .

ئێمە لەسەر میزێک دانیشتبووین کە چوار سەندەڵی لە دەوروبەری داندرابوو، لێوانێکی پڕ لە کاغەزی رەنگاوڕەنگ لەسەر میزەکە بوو .

ئەمجار شاگردێک هات و دوو دەوری سەبزی و سێچوار کوتە نان و چوار کەوچک و چەنگاڵی لەسەر میزەکە دانا و لەجیاتی ئەوان یەک دوو تەنەکەی ( ژیتون)هەڵگرت و رۆیی ، پاش ماوەیەک بە

چواردەوری برنج و خۆرشتەوە گەڕاوە ، هەر یەکەی یەکی لەپێش دانا‌ین ، ئەوچار توونگەیەکیشی دۆ هێنا و بەجێی هێشتین .

من کە تا ئێستا دەوری بە تەنێم نەدیبوو ، لە خۆشیان گوتم :

ـ ئەوە هەمووی هی منە ؟

کاکم لە وەڵامدا گوتی :

ـ ئەوە بۆ هێندەی دەڕێسی ، سەرت بەردەوە ، نانت بخۆ .

بێ‌ئەوەی دەست بۆ کەوچک و چەنگاڵ بەرم بە پاروان بەربوومە برینجەکە دایکم لە حاڵێکدا گووپی پڕ بوو دەیگوت :

ـ سەبر دەڵێی لەشکرت بە دواوە . پارووی چکۆڵە بکە ، دەخنکێی .

بە دەم خواردنەوە ئەوەندەم چاو بەم لاو ئەو لا دا گێڕا کە پارووەک لە ئەوکم ما ، دوو سێ جار کۆخیم بەلام پاروو جێی خۆی تازە خۆش دەکرد چاوم لە ژێرڕا هات ، کاکم کە لە پەنام بوو بە هەموو هێز و قەوەتی خۆی دوو مستی لە پشتم دا و گوتی :

ـ بابە قەتار!! دوایەش بە پەلە لیوانێکی دۆ دامێ.. دۆیەکەم پێدا کرد پارووەکەشی لەگەڵ خۆی راماڵ دا .

ئەمجار کە لە خنکان رزگاریم بوو ، هەناسەیەکم هەڵکێشا ، بەلام نەمدەوێرا بۆلای تان خواردن هەر بچم بەڕاستی زگم بەخۆم سووتا . بۆ وەی بزانم کاکیشم هەر ئەو حاڵەی هەیە یان نا ،گوتم

ـ هیچی دیکەش ناخۆم ،کاکم گوتی :

ـ گیان بخۆ ! جا چماوە ماڵ وێران ، مەگەر قاپەکان بخۆی هێندێک راوەستام و چاوم لێکردن .ئەوانیش دەستیان کێشاوە جا ئەوجار چایان هێنا ،ژێرپیالەی نەگەڵ نەبوو، وامزانی ساردە ،فووشم لێ نەکرد ، هەوەڵ قومم خوارد هەتا چووە خواری سووتاندی بەلام لە ترسان متەقم نەکرد و سەرم داخست هەتا بنان گوێم سوور هەڵگەڕا .

هەر چۆنێک بوو هەستاین و بەرەو گاراجی مەرەند وەڕێ کەوتین چاومان بە زۆر شتی جوان جوان کەوت . هەموو جارێ لە دڵی خۆمدا دەمگوت :

ـ ئەگەر هاتینەوە لە تەلیسە پوولەکە هێندێکی هەڵدەگرم و هەرچی پێم خۆشبوو دەیکڕم ، بەو هیوایە گەیشتینە گاراج ، لەوێ سوار بووین و ماشێن رۆیی،سێ چوار کیلۆمیتری مابوو بۆ تەوریزێ دابەزین و رێگای کوورە دیاری کراوەکەمان گرتە بەر دوای سەعاتێک رێ پێوان، ماندوو و شەکەت گەیشتینە کوورە .

لە دوورەوە کۆگای خۆڵ و فەنەری خشتمان لێ دیار بوو ، کە نزیک بووینەوە چاوم بە هۆڵێکی گەورە کەوت کە چەند دەرکەی هەبوو ،لەبەر هەر دەرکەیەک دوو سێ منداڵی بچووک بە تووێی کراسێکەوە کایەیان دەکرد. هەر یەکەی کوتە پەڕۆیەکیان بە دەرزیلە لەسەر شانی قایم کردبوون ، چڵم و لیکیان تێکەڵ ببوو و بە زار و لووتیان دا داچۆڕابوو،هەر کە ئێمەیان دیت هاتنە پێش و لێمان خوردبوونەوە.

لای ئێوارە بوو،دوو سێ دراوسێ بە دیتنی ئێمە بەرەو پیرمان هاتن و دوای تۆ خوش و من خۆش یەکیان ئێمەی بردە ماڵی خۆیان و چایەکی بۆ دانا‌ین ، ئەو چایە ماندوویی لە لەش دەرکردین و ئارەقەی رێگای سڕینەوە . کاکم هەستا و بەرەو مەیدان وەڕێ کەوت ، تا لە چۆنیەتی کاروباری ئەم کوورەیە باشتر تێ بگا ،ئێمەش چووین ژوورەکەی خۆمان ئاو پرژێن کرد و رامان خست

ژوورەکەمان لە لایەک سەماوەرە کۆنێکی نەفتی و کەشەفێک و چوار پێنج ئیستیکانی لێ بوو ،لە لایەکی دیکەوە تایەک ئارد و نیوە تایەک سێوک و سێ چوار تاوە و مەنجەڵ و عەلادینێک

داندرابوو،راخەریشمان بەڕەیەک و دوو حەسیر بوو.

شەو نان و چامان بە پەنیر و چای شیرین خوارد و پاشان کاکم گوتی :

ـ مەیدانی ئێمە لەگەڵ دراوسێیەکمان هاوبەشییە . کارەکەشمان شەریکایەتییە . جا لە منوو نەکەوێ قوڵ هەڵماڵێ جەنگەیەتی ،دەبێ کارێکی وابکەین بە رووسووری بچینەوە، بە قەولی کا حەمە کوتەنی :

" دەبێ بە تەلیسان پووڵی بەرینەوە تا لەژێر قەرزان بێینە دەر "

هەموو بەڵێنمان دا ،هەر کەسە لەبەر خۆیەوە بیری لە زۆر کار کردن و زۆر پەیدا کردن دەکردەوە ، ئاخر هەموو چارەڕەش و رووت و قووت و هەژار و برسی بووین

جێمان راخست و تێخزاین ، بەڵام چون گەرم بوو شتمان کەم بە خۆ دادا، خودا ئەو رۆژەتان نەسیب نەکا ، مێشولە دەگیانمان بەربوون و هەتا توانییان خوێنیان مژتین ، ئاراوقاراویان لێ هەڵگرتین ، ناعیلاج هەستاین و ئاورمان کردەوە ...

تاریک وڕوونی بەیانی قیتیان کردینەوە و بەرەو مەیدانیان بردین ، هەموو گیانم گرمۆڵە بوو، هەر پێم دەکرا خۆ هەڵکڕێنم . ئەوەندەم دەست و لاق و لاجانگم خوراندبوو هەمووی لە خوێن هاتبوو، گەیشتینە مەیدان ، کاک عەزیز کە سەرگەورەی ئێمە بوو ، پێمەڕەکەی چەقاند و دەستی هاویشتە سەر و گوتی :

ـ ئێرە مەیدانی شەڕ واتە مەیدانی بەزیو و نەبەزە، هەرکام لە ئێمە باشتر دەرد و خەفەتی خۆمان دەزانین و بۆ چارەسەرکردنی ئەم دەردە دەبێ تێبکۆشین ، شەو و رۆژ نەوەستین ، دەوای دەردی هەموو شتێک پووڵە و بەس. تا دەتوانن خشت ببڕن و کار بکەن هەر چەند مانگە! دوایە دەحەسێنەوە ،جا هەزار جار لە چاوی منوو کەوێ بزانم چ دەکەن ؟

دوایە ، قوتووی توتنی دەرێنا ، بە دەستە قولە ئەستوورەکانی جگەرەیەکی هەڵبەست ، لە مۆدنەکەی نا و بە شەمچەیەک ئاگری دا و چرە دووکەڵی ساز کرد ، نێو چاوانی پڕ لە گنج بوو پیاوێکی تێک سڕماوبوو،لاقی تا سەر ئەژنۆیان هەڵکردبوو وادیار بوو چەرمەسەری زۆر دیوە "

چاوم لە مەیدان گێڕا . چەند کۆما خۆڵ هەڵدرابۆوە بە چاو ئیشارەیان دەکرد ' وەرن هەڵمان گرن،کەمێک لەولاتر خۆڵەمێش دەبیندرا . مەیدانەکە ماڵدرابوو، ئاوپرژێن کرابوو چاوەڕوان بوو تەنیا ئێمە هەڵات هەڵاتی بەسەردا بکەین ، ئەویش قدیلکەی بێ و لە تاوان دەست بەژگی بگرێ .

بە دەستووری کاک عەزیز قالبمان لە قەراغ قوڕ بە دەسەوە گرت ، قوڕەکە لایلۆنی پێدا درابوو، هێشتا دەستمان بە کار نەکردبوو کە کاک عەزیز گوتی :

بەر لە هەموو شتێک قالبەکانتان بە خۆڵە مێش کەن ، تا خشتەکە جوان دەربێ دوایە قالبەکە دانێن و بە دەست تەپۆڵکەیەکی قوڕ پێدادەن ، ئەوجار بالتراشە دارەکەی پێدابێنن با لێک و لووسی بکا ، ئیدی ئەو جار بەغار رۆی بکەن و بگەڕێنەوە .

خۆی دەستی بە خشت برین کرد ، تا ئێمەش فێر بووین . تا سەعات هەشت کارمان کرد و ئەوجار بۆ بەر چایی خواردن وچانمان دا ، دوای چارەگێک گەڕاینەوە و تا سەعات دوازدەی نیوەڕۆ کارمان کرد و دیسان بۆ نەهار مەیدانمان بەجێ هێشت ، دوای نەهار دەستمان کردەوە بە خشت برین ، تا سەعات نۆی شەو کوتامان . شەکەت و شەلاڵ گەڕاینەوە . شەو داهاتبوو کەس نازانێ چۆنم دوو سێ پاروو نان خوارد و لەجێ خزام .

لە ترسی مێشوولان هەر دەتگوت جۆلاین ، جینگلمان دەدا .

بەیانی کە هەڵیان ستاندم دەتگوت ئەوە بە چواران گرتوویانم و نایەڵن هەستم ، لاقم وەک بزماری لێهاتبوو ، دەستەکانم لە سەری پەنجەوە تا نێوان شانم گیرابوو، وەک بەراز ملم رەق ببوو، پشتم دانە دەهاتەوە .

هەر چۆنێک بوو هەستام. دەستمان بە کار کرد، تا رۆژی پێنج شەمۆ کە گوتیان تانیوەڕۆ کار دەکەین و نیوەڕۆ حەمام دەکەین و دەڕۆین بۆ تەورێز هێندێک دەگەڕێین و برێکیش کەل و پەل دەکڕین .

لە خۆشیان شاگەشکە بووم دەتگوت جێژنەیە ، بەخەیاڵی ئەوە کە تەحتیل دەبین لە رۆژان پترم کار کرد.....

* * *

چرای تەورێز دیار بوون. ژیانی خۆمانم هاتەوە بەر چاو ، ئێستاش زۆر ماڵ هەن لەبەر چراتۆڕ دادەنیشن . ئێسک و پێستێکیان ماوە و بەس، لەسەر ئەو حاڵەشدا هەدادانیان نیە. زۆرن ئەوانەی مانای حەسانەوە و پێکەنین و خۆشیان هەست نەکردووە.

چاوێکم لە مەیدانەکان کرد و دێوەزمەی رەشی خوێنمژم دی ئەگەر چاوم لە شاری تەورێز کرد،پەژارە و خەفەت دایگرتم .

دوو دڵۆپ فرمێسک لە چاوانم هاتنە خوار و بەر چاویان تاریک کردم،دیسان قسەکانی کاک حەمەم وەبیر هاتەوە کە دەیگوت :

" بە تەلیسان پوولی دێنینەوە بە تەلیسان "

* * *

# زانایانی بەناو بانگی کورد...

## مەلاعەلی قزلجی

سەیدعەبدوللاسەمەد

پێویستە بزانین کە لە چوار چێوەی شارستانیەتی ئیسلامیدا کە یەکێک لە چوار چێوە هەرە گرینگەکانی شارستانییەتی ئینسانی یە قەومی ئێرانی لێهاتوویی یەکی سەرسوڕهێنەری لە عیلم و زانست و فەلسەفەدا بە دنیا نیشان داوە و هەموو دەزانین کە خاکی هونەرپەروەری ئێران کەسانێکی وەکوو " ابن سینا و غزالی و رازی و خواجەی طوسی و فردوسی و نظامی و سعدی و مولوی و عطار و سنایی " و هەزاران فەیلەسووف و زانا و شاعیری تری پێگەیاندوە و لەم بەینەدا کورد کە بە یەکێک لە رەسەن ترین نەتەوە ئێرانی یەکان دەژمێردرێ شوێنێکی زۆری بووە و بە درێژایی مێژووی شارستانییەتی ئیسلامی زانایانی گەورەی وەکی: **"احمد بن یوسف الکواشی"** ( **موفەسسیری موحەقیق**) **" محی الدین خلاطی"**، (شەریک و جێگیری خواجە نەسیری تووسی لە بنیاد نانی رەسەدخانەی مەراغەدا )، **" ابن الصلاح"** ( زانای گەورە )، **"ابن الحاجب"** **" عبدالرحیم عراقی** "(**ماموستای** ابن حجر عقلانی)، **" ابراهیم کردی "**، **"ابن کج دینوری "** ( تەبیعی دانی بە ناو بانگ) **" ابو حنیفە دینوری "**، **" ابن خلکان** "(مێژوونووسی **بە** ناو بانگ )، **" عزالدین علی ابن الاثیر"**، ( مێژوو نووسی گەورە ) ،**"ابن نجا** "(فیلسوف) **" مولانا خالد نقشبندی"** ( عارفی گەورەی کورد ) و سەدانی تری پێشکەش بە کوڕی زانست و فەرهەنگی ئیسلامی کردووە کە ناویان لە مێژووی پڕ شانازی عیلم وشارستانیەتی ئیسلامیدا تۆمار کراوە بەڵام بە داخەوە زوربەی زانایانی کورد بە تایبەتی ئەوانی پێشووتر بە هۆی دوور بوون لە شارە گەورەکان و دانیشتن لە کوێرە دێیەک و گۆشەی شارێک ناوبانگیان دەرنەکردوە و نووسراوە و شوێنەواریان دراوەتە دەستی فەراموشی و فەوتان .

لە راستیدا پلە و پایەی عیلم و زانستی زانایانی کورد بە هیچ جۆر لەگەڵ باری کۆمەڵایەتی ئەواندا یەکتری نەگرتووەتەوە .

خوا لێ خۆشبوو **" مەلا عەلی قزلجی "** لە وڵاتی قزلجە لە دوایین ساڵەکانی چواریەکی یەکەمی سەدەی ١٣ ی کۆچی لە بنەماڵەیەکدا کە پشتاو پشت زانایانی ئاینی بوون هاتووەتەدنیاوە. **" مەلا محمد**"ی باوکی لە فنوونی ئەدەب و زانستە شەرعی و ئاینی یەکاندا دەستێکی باڵای بووە.

مەولانا قزلجی سەرەتای نەحو و سەرف و فقەو عقایدی لای باوکی خوێندووە، مەلا محمد" نوسخەیەکی لە کتێبی "شەرحی مەلا سەعدی تەفتازانی" لەسەر " تەسریفی زەنجانی"کە لە کتێبە پڕ بایەخەکانی عیلمی سەرفە بۆ کوڕەکەی نووسیوەتەوە کە ئەم نوسخەیە ئێستا بە ساغ و سلامەتی ماوەتەوە .

پاشی ئەوەی کە لە لای باوکی سەرەتاکانی خوێندووە هەر لەسەر ئیزنی ئەو بۆ خوێندنی پتر باری سەفەری تێکناوە و شارە و شار و دێ بە دێ بە شوێن فێربووندا گەڕاوە تاکوو دوای وەرگرتنی ئیجازەی تەدریس لە ماموستای گەورەی خۆی "**مولانا محمدیائی**" لەسەر ویستی خوا لێ خۆشبوو " محمدامین بیگ " مالکی تورجان لەو دێ خۆش و لاپەڕەدا دەستی بە تەدریس کرد و هەتا دوایین هەناسەکانی ژیانی وەکی شەمێک سووتا و دەور و بەری خۆی رووناک کردەوە، بە شاهیدی عارف و زاناکانی سەردەمی خۆی،ساحیبی دڵێکی دروست و دەروونێکی خاوێن بووە .

هیچ کاتێک ئێرەیی و بەرچاوتەنگی وکاری ناشایستی پێوە نەبینراوە و تەنانەت لە باس و پیلە و دمەتەقەی زانستیش خۆی پاراستووە تاکوو نەکا تێکەڵ بە هەوای نەفس بێ و غوروور و خۆ بە زۆر زانی و فیزی بەسەردا زاڵ بێ ، هەمیشە وەدوای قسەی حەق کەوتووە و حەقی سەلماندووە .

مەولانا قزلجی پاشی تەواو کردنی خوێندنی سەرەتایی لە لای باوکی بەڕێزی،بە خزمەتی سێ کەس لە زانایانی سەردەمی خۆی کە هەرسێک ناویان "محمد" بووە گەیشتووە و بۆ ماوەیەکی پتر لە بیست ساڵ لە خزمەتیاندا خەریکی فێر بوون و تێپەڕاندنی پلەکانی زانست و تەحسیلاتی بەرز بووە .

**ـ ماموستاکانی مەولانا قزلجی :**

**۱ ـ "مەلا محەممەدی بانی" :**

کە زانایەکی هەڵکەوتووی سەردەمی خۆی بووە ،ئەو تەواوی ئەو کتێبانە کە لەو زەماندا خوێندنیان باو بووە لە سەرەتای سەرف و نەحوڕا تا دەگاتە علوومی بەرز هەمووی بە خەتی خۆی زۆر بە دروستی و جوانی نووسیوەتەوە ، دەربارەی توند نووسینەوەی ئەو زۆر نەقڵ دەگێڕنەوە ، بۆ وێنە دەڵێن :

کتێبی "تەفسیری بەیزاوی" لە سەرەتا تا دوایی لە ماوەی کەمتر لە مانگێکدا نووسیوەتەوە و ئەمە شتێکی وەک موعجیزەیە ئەم نووسراوە لە دوو بەرگدا ئێستا ماوە .

دەگێڕنەوە کە کتێبخانەکەی دووجار لە شەڕی عەشیرەتەکانی بانەدا ئاوری گرتووە و هەرچی تێیدا بووە سووتاوە و بووەتە دووکەڵ و سووتوو کەچی سەر لە نوێ ئەم ماموستا مەزنە بە سەبر و لەسەرەخۆیی یەکی سەیر و کەم وێنە کتێبە فەوتاوەکانی هەر بە دەسخەتی خۆی نووسیوەتەوە .

**۲ ـ "مەلا محەممەدی مفتی زەهاوی" : ( ۱ )**

ئەم زانا و عەللامە گەورەیە لەسەردەمی خۆیدا تاقانە بووە و بە زمانەکانی فارسی و عەرەبی شیعری جوانی داناوە . ئەو کاتەی کە مفتی لەگەڵ "ناصرالدین شای قاجار"دا مولاقاتیان دەبێ و بە والی بەغدا دەڵێ:" مفتی از ماستەو اهل ایران است" واتە : مفتی لە ئێمەیەوخەڵکی ئێرانە . والی وەڵام دەداتەوە کە بەڵێ ، مفتی لە دایک بووی ئێرانە بەڵام ئێمە لە تیشکی کەماڵات و عیلم و زانستی وی کەلک وەردەگرین.

خوالێ خۆشبوو "**حاجی ملک الکلامی کوردستانی**"( ۲ ) لە سەیاحەتنامەی خۆیدا دەنووسێ "ئەلحەق وێنەی مفتیم لە عیلم و زانست و فەساحەت و بەلاغەت و کەماڵدا لە هیچ وڵاتێکی ئیسلامیدا نەدیوە"

**۳ ـ "مەلا محەممەدی یائی":**

مەلا محەممەدی یائی لە مزگەوتی جامیعی ساوجبلاغی موکریان " مەهابادی ئێستا " دەرسی کوتووە .

خوالێ خۆشبوو قزلجی پلەی عیلمی مەلا محەممەدی یائی زۆر لە مفتی زەهاوی بە بەرزتر زانیوە. مەولانا محەممەدی یائی لە عیلم و زانست و پاکی و تەقوا پایەی عیرفانیدا لەسەردەمی خۆیدا کەم وێنە بووە .

**– بەرزترین شاگردانی مەولانا قزلجی :**

**١ –"مەلا عەبدوڵڵای پیرە باب" :**

کە لە ساڵەکانی دوایی تەمەنیدا لە مزگەوتی"هەباس ئاغای" سابلاغ خەریکی دەرس گوتنەوە بووە .

خوالێ خۆشبوو"میرزا عەلی قازی" یەکێک لە شاگردەکانی ئەو بووە و هەروەها مەلا عەبدولڕەحمان دەرس بێژی مزگەوتی سوور (نەوەی عەللامە یائی)، "مەلا محمد حوسێنی تورجانی"کە دوو کتێبی بە سوودی لە دوا بەجێ ماوە ، یەکیان شەرحێکی تەواوە لەسەر " فرائض"ی مامۆستا قزلجی و ئەوی تریان ڕێکخستراوەی " تحبة الفکر در علم درایە الحدیث"ە ، " مەلا عەبدوڵڵای وەلزی" ئەمانە هەموو لە شاگردانی مەولانا عەبدوڵڵای پیرە باب بوون و لە خەرمانی زانستی وی بەهرەیان وەرگرتووە .

مەرحوومی پیرەباب لەسەر زوربەی گیر و گرفتەکانی ریاضیاتی کۆن چ"جەبر و مقابلة چ "هەندەسە"چ"اکر و مرایا و مناظر" و چ عیلمی هەیئەت و نجووم شتی زۆر بە کەلکی نووسیون و روونی کردوونەوە. بەڵام بەداخەوە کە ئەم نووسراوە و توێژینەوە کەم وێنانە لە گۆشەی بێدەنگی و فەرامۆشیدا کەوتوونەوە و هەر بەشەی لە جێگەیەکە و ئەگەر لە کۆکردنەوەیاندا پەلنە نەکرێ ترسی ئەوە هەیە کە بە یەکجاری لەناو بچن و بفەوتێن .

**٢ –"مەلا عەبدولڕەحمان مەشهوور بە پێنجوێنی" :**

ئەم زانا گەورەیە کە ماوەیەکی زۆر لە فێرگەی تورجان دەرسی خوێندووە و هەر لەوێش ئیجازەی وەرگرتووە یەکێک لە بەرزترین زانایانی مەنتیق و فەلسەفەیە و نووسراوە و پەراوێزەکانی لەسەر ئەم کتێبانە مەشهوورە. جێگەی خۆشحاڵیە کە زوربەی ئەم نووسراوە و پەراوێزانە لە میسر و بەغدا لە چاپ دراون.

**٣ –"سەید حەسەنی چۆڕی" :**

پشتاوپشت دانیشتووی وڵاتی مەریوان بوون ، لە باپیرانی گەورە و بەناوبانگی سەید حەسەنی چۆڕی "مەولانا سەید ئەبووبەکری مصنف"ە ( ۴ )کە پتر لە سێسەد ساڵ لەمەوپێش دەژیا .کتێبی "وضوح " لە کتێبە دروست و باوەڕ پێکراوەکانی مەلا ئەبووبەکرە هەر وەها کتێبی "طبقات" کە لە مێژووی ناودارانی مذهبی شافیعیدەدوێ و یەکێکە لە کتێبە موعتەبەرەکانی مێژوویی لە نووسراوەکانی ئەوە . ئەم کتێبە زۆر بە ڕێک و پێکی لە بەغدا لە چاپ دراوە .

لە (قاموس الاعلام )دا سەبارەت بەم پیاوە گەورەیە ئاوا هاتووە :"سەید ئەبووبەکر ساحێبی کتێبی " وضوح " لە ساڵی ١٠١۴ دا کۆچێ دوایی کردوە و سەبارەت بە ئەوەی کە نووسراو و دانراوی یەکجار زۆر بووە بە "مصنف" ناوبانگی دەرکردوە" . و(محمد طاهر بروسەء ) کە لە زانایان و نووسەرانی دەوڵەتی عوسمانی بووە دەنووسێ: " کتێب و نووسراوەکانی سەید ئەبووبەکری مصنف ئەوەندە زۆرە کە تەنیا ناو بردنیان ماوەیەکی زۆری پێ دەوێ و نووسراوەکانی بە عەرەبی و فارسین ."

مەبەست لەم وتانە ئەوەیە کە سەید حەسەنی چۆڕی بەراستی رۆڵەی ئەم باپیرەیە بووە و جێگەی ئەوی بە چۆڵی

نەهێشتۆتەوە ،ئەو لەسەر زۆربەی کتێبەکانی "حکمت و کلام و منطق" پەراوێز و توێژینەوەی زۆر ورد و ژیرانەی نووسیوە و ناوی هەندێک لە نووسراوەکانی ئەمانەن :

" پەراوێز لەسەر سەعدوللای بچووک" ،"پەراوێز لەسەر تەسریفی مەلا عەلی" ،"پەراوێز لەسەر فەریدەی جلال الدین سیوطی" ،"پەراوێز لەسەر (تهذیب المنطق)" ،" پەراوێز لەسەر جەلالی مەنتیق" ،"پەراوێز لەسەر گەلەنبەویی بورهان" ، " پەراوێز لەسەر عەبدولحەکیم شەرحی شەمسی" ، " الرسالە الکلامیە" ، " پەراوێز لەسەر تەفسیری بیضاوی لەم کتێبە دا گەیشتوەتە سوورەتی ( القیامە ) و لەوێدا کۆچی دوایی کردوە "

دەگێڕنەوە کە سەید حەسەنی چۆڕی لەپاش ئەوەی کە خوێندنی تەواو کرد و زۆر ولاتی بە شوێن عیلم و فێربووندا پشکنی بریاری لەسەر گەڕانەوە بۆ گوندی "چۆڕ"دا . لە درێژایی ئەم گەڕانەوەیەدا گەلێک جار لە شار و گوندان لەگەڵ زانایان و مامۆستایان باس و راوێژ و دەمەتەقەی عیلمی دەکرد و بەسەر هەموواندا زاڵ دەبوو ،هەر لەم سەفەرەدا بوو کە رێگەی کەوتە "تورجان" و بۆ تاقی کردنەوە هات و لە مەحزەری دەرسی مەولانا قزلجی دانیشت. مەبەستی تەنیا هەڵسەنگاندنی پایە و مەقامی قزلجی بوو بەلام کە دەرسەکە دوایی هات گوتی :من ئیستا دەزانم کە ئەوەی فێری بووم شتێکی زۆر کەمە و دەبێ سەر لە نوێ دەس پێ بکەمەوە ، لەو رۆژە را بە ناوی قوتابییەک ناوی خۆی لە فێرگەی تورجاندا نووسی و بۆ ماوەی چاردە ساڵی دی لەم دێیە و لە خزمەتی مەولانا قزلجی سەرگەرمی خوێندن بوو تاکوو ئیزنی تەدریسیشی هەر لەوێ وەرگرت .سەید حەسەن لە ساڵی ١٣٠٥ دا چووەتە حەج و لە ساڵی ١٣٢٣ لە تەمەنی حەفتا ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە .

**٣ ـ"مەلا عەبدوللای داغستانی ، مەشهوور بە جەوانشیر" :**

خوالێ خۆشبوو جەوانشیر خەڵکی داغستانی قەفقاز بووە و لەوێرا بە شوێن عیلم و زانستدا هاتۆتە تورجان.ئەم مەرحوومە زۆربەی کتێبە زانستییەکانی بە دەسخەتی خۆی نووسیوەتەوە و پەراوێزی بەکەلکی لەسەر نووسیون عیلم و شەریعەتی لە لای مامۆستا قزلجی خوێندووە و تەریقەتی عیرفانیش لە خواناسی گەورەو بەناوبانگی کورد "شێخی سراج الدین"( ٥ ) فێر بووە و لە مەحزەری پڕ بەرەکەتی ئەم عارفە رەببانییەدا خەریکی سەیر و سلووک و زیارەت و دیتنی مقاماتی عیرفانی بووە .وادەگێڕنەوە کە مەرحوومی داغستانی وەختی خۆی دەکردە دوو بەش ،نیوەی ساڵ لە هەورامان لە خزمەت شێخی سراج الدین دەبوو و نیوەکەی تریش لە تورجان لە مەجلیسی عیلمی مەولانا قزلجی دادەنیشت .

داغستانی شارەزاییەکی باشی بەسەر ئەدەبی فارسیدا هەبووە و زمانی رووسیشی جوان زانیوە .رەسالەیەکی لەمەر هەیئەتی نوێ لە رووسییەوە کردۆتە عەرەبی و داویە بە "مەولانا قزلجی" تاکوو بیر و رای خۆی سەبارەت بە رەسالەکە دەرببڕێ.مەولانا تەنیا دوو دێری لە پەراوێزی کتێبەکەدا نووسیوە بەم جۆرە: " چونکە ئەمە عیلمێکی نوێیە و هێشتا لای ئێمە باو نەبووە و بۆ ئێمە روون نیە ، بە هیچ جۆرێک ناتوانم لەم بارەوە بیر و رایەک دەرببڕم"

ئاشکرایە کە هەر ئەم چەند وشەیە تارادەیەکی زۆر پایە بەرزی و رۆشنبیری و ئینسافی زانستی قزلجی دەگەیەنێ.

ئەم چوار زانا گەورەمان لە نێوان سەدان کەس لە شاگردانی مەرحوومی مەولانا قزلجی هەڵبژارد کە بە " فقهای اربعە" مەشهوورن.

**ـ شوێنەوارەکانی مەولانا**

**قزلجی :**

مەرحوومی قزلجی لەسەر زۆربەی کتێبە باوەکانی سەردەمی خۆی نووسراوە و پەراوێزی "مدون"ی واتە لە سەرەتاوە تا دوایی کتێبەکە نووسیوە. هێندێک لەم نووسراوانە ئەمانەن :

پەراوێز لەسەر **تەسریفی مەلا عەلی**، پەراوێز لەسەر **شەرحی مەلا جامی**، پەراوێز لەسەر **سیوطی**، پەراوێز لەسەر **مغنی اللبیب**، پەراوێز لەسەر **تسهیل ابن مالک**، کە کتێبێکی گەورە و تەواوە لە نەحودا. پەراوێز لەسەر **کمال شرح شافیە**، پەراوێز لەسەر **شەرحی رضی**، پەراوێز لەسەر **شەرحی شمسیە**، پەراوێز لەسەر **عبد الحکیم**، کە دژوارترین کتێبی فەلسەفە و مەنتیقە. تعلیقات لەسەر **مطول**، تعلیقات لەسەر **مختصر**، پەراوێز لەسەر **مفتاح العلوم**ی سکاکی، پەراوێز لەسەر **جمع الجوامع**، پەراوێز لەسەر کتێبی **وضوح**، پەراوێز و راست کردنەوە لەسەر دەستە کتێبی **تحفەی ابن حجر**، کە دژوارترین کتێبی "فقە"ی شافیعی یە، پەراویز لەسەر **عصام الدین استعارە**، تعلیقات لەسەر **تەفسیری بیضاوی**، پەراوێز لەسەر **شرح قاضی**، پەراوێز لەسەر **حکمة العین**، پەراوێز لەسەر **عصام الدین وضع**، تعلیقات لەسەر **شەرحی قەسیدەی بوردییە**، تعلیقات لەسەر شەرحی **سبعەی معلقە**، تعلیقات لەسەر **لامیە العجم طغرائی**، تعلیقات لەسەر **قەسیدەی لامیە العرب**، تعلیقات لەسەر **شەرحی قصائد ابن ابی الحدید**، تعلیقات لەسەر **خمریە ابن الفارض**، تعلیقات لەسەر **تائیە الکبری ابن الفارض**، تعلیقات لەسەر **قەسیدەی اشکنوائیە**، تعلیقات لەسەر **مقامات حریری**، تعلیقات لەسەر **قامووسی فیروز آبادی**، تعلیقات لەسەر **عبدالغفور لاری**، تعلیقات لەسەر **لاری**، لە حیکمەتدا، پەراوێز و تعلیقات لەسەر **مختصر قانون**،ی ابن سینا لە طبدا، راست کردنەوە و پەراوێز لەسەر **ابن الاثیر** لە مێژوودا، **ابن خلکان**، **حبیب السیر**، شەرحی **نخبة الفکر در علم درایة الحدیث**، پەراوێز لەسەر **شەرحی الفیە عراقی**، لە علم درایة الحدیث، راست کردنەوە و پەراوێز لەسەر **بخاری** و **مسلم**، لە حدیثدا، تعلیقات لەسەر **رسالەی تشریح الابدان**، تعلیقات لەسەر **اتقان سیوطی**، تعلیقات لەسەر **شفای قاضی عیاض**، پەراوێز لەسەر **تورات و انجیل**، تعلیقات لەسەر **پەراوێزی جلال دوانی** لەسەر **شرح تجدید**، تعلیقات لەسەر **شەرحی عقاید نسفی**، تعلیقات لەسەر **شەرحی عقائد جلال دوانی**، تعلیقات لەسەر **شەرحی مواقف**، تعلیقات لەسەر **شەرحی تهذیب الکلام**، تعلیقات لەسەر **شەرحی منظومەی شاطبی**، کتێبێکی گەورە و بەسوودە لە عیلمی قرائت و تجویدی قورئاندا کە لەو پەڕی دیققەت و حەوسەلەدا زۆر بە تەواوی نووسراوە. پەراوێز لەسەر **حفایە علی الکفایە**، تعلیقات لەسەر کتێبی **رفع الخفاء**، پەراوێز لەسەر **تشریح الافلاک**، پەراوێز لەسەر **شەرحی اشکال التاسیس**، لە هەندەسەدا، پەراوێز لەسەر **رسالە الحساب**، پەراوێز لەسەر **شەرحی جلی**، لە عیلمی حساب و جەبردا. پەراوێز لەسەر **شەرحی جواد** لە حیسابی استدلالی و جەبردا، منظومەی عەرەبی لە **فرائض و مواریث**، منظومەی عەرەبی لە **تجوید دا**، **مقولات عشر**، نووسراوەیەک لەمەر چۆنیەتی مناظرە، شەرحێکی کەم وێنە لەسەر بسم اللە ـ الرحمن الرحیم و زۆر

شوێنەواری بەکەلکی تر ...

– دوایـــــی –

مەدرەسەی تورجان لە پاش وەفاتی قزلّجی لە ١٢٩٥ی کۆچی مانگی دا چەند سالێش لە ژێر چاوەدێری کوڕی گەورەی ئەو "مەلا محمد حەسەن" درێــــژەی بە کاری خۆی داوە ،مەرحوومی مەلا محمد حەسەن لە هونـەری عیلمی و عەمەلیدا پایەیەکی بەرزی بووە بەتایبەت لـــە فقە و اصول و ئەدەبی عەرەبدا ماموستایەکی تەواو بووە و لە ئەدەبی فارسیشدا بەهرەیەکی زۆری بووە .لای هەموو کەس بە " مەلای گەورە " بە ناوبانگ بـــووە .

تا چەند سالێک ئەم کوڕە جێگەی باوکی پڕ کردۆتـــەوە بەلاّم لەوەراکە هەر کەمالّەی زەوالێکی بە شوێنــدادێ و گولّ کە پشکووت نـــۆرەی هەلّوەرینی دێ ، مـەدرەسـەی تورجانیش لە پاشی سەرەمێکی دوور و درێژ هات و چــۆ و جەلال و شکۆ،وردە وردە هاتەوە ریزی گونــدە لاپــەرەکانــی کوردستانی موکری و ئێستا نزیکەی نەوەد و چوار ســالّ بەسەر لەناوچوونی ،مەدرەسەی تورجاندا تێدەپەڕێ .

بەم جۆرە عەللامـەی بـە ناوبانگ مەلا عەلی قـزلّجـی بناغەدانەریدا رالعلمی تورجان پتر لە چل و پێنج سالّ لـەم مەدەرەسە دا خەریکی بـلاّو کردنەوەی عیلم و فەن لــە معقول و منقول و ئەدەبـــدا بووە . رەزای خودای لێ بێ و رۆحی پاکی بە جەنـنــەت شاد بێ .

**ئەو سەرچاوانەی کەلکم لێ وەرگرتوون :**

**١ ـ مقالهء استاد احمـــد ترجانی زاده ـ سالنامـهٔ فرهنگ مهاباد ـ فروردین ماه ١٣٣٥ .**

هەلّبەت بەشێکی زۆری ئەم وتارەم وەرگێڕاوەتەوە و لەم باسە دا کەلکم لێ وەرگرتووە .

**٢ ـ مقالهء آقای محمد مکری ـ دورهء مجلهء یادگار ـ سال پنجم شمارهء ششم و هفتم ـ بهمن ماه سال ١٣٢٧ .**

**٣ ـ بنەمالّەی زانیـاران ـ مەلا عەبدولکەریمی موودەڕڕیس بەغدا ـ ١٩٨٤ ی.ز .**

**٤ ـ یادی مەردان ـ مـەلا عەبدولکەریمی مودەرریـس ـ بەغدا ـ ١٩٨٣ ی. ز**

پەراوێز :

( ١ ) ١٧٩٢ ـ ١٨٩٠ ی.ز

( ٢ ) ناوی عەبدولمەجید کوڕی میرزا عەبدولکەریمە و نازناوی شیعری ( مەجدی ) یە .

( ٣ ) ماموستا مەلا عەبدولکەریمی مودەرریسی بیارە لە کتێبی ( یادی مەردان ) دا دەفەرمێ: حاجی سەیـد ـ حەسەن لە سالی ١٣٢٣ لە تەمەنی حەفتا سالێدا کۆچی دوایی کردووە ،

کە ئەم شیعرەی‌نێو گیوومە بە حیسابی ئەبجـــەد دەکاتە ١٣٢٣ کە سالّی کۆچی دوایی ئەو خوا لـێ خۆشبووەیە .

ئەمجار ماموستا مەلا عەبدولکەریم لـە کتێبـی ( بنەمالّەی زانیاران ) دەربارەی سالّی وەفاتی سەید حەسەن دەفەرمێ : ( لە سالّی ١٣١٢ ی کـۆچـی دوایی کردووە ). لێرە دا بە شاهیدی شیعرەکـەی ( مجدی ) ، سالّی ١٣٢٣ دەشێ دروست تـــر بێ ، ( ١٢٥٥ ـ ١٣٢٣ ی. کۆچی )

( ٤ ) مەلا ئەبووبەکری مصنف ( ٩٤٠ ـ ١٠١٤ ی .کۆچی).

شیاوی باسە، کە: دوکتۆر محمد موکری و ماموستا مەلا عەبدولکەریمی بیارە لە کتێبی یادی مەردان و بنەمالّەی زانیاراندا شەجەرەی سەید حەسەنی جۆری یان نووسیوە تاکوو دەچێتەوە سەر مەلا ئەبووبەکری مصنف.

ماموستا مەلا عەبدولکەریم لە لاپەرەی ( ٥٠٦ )ی بنەمالّەی زانیاراندا دیسان شجرەی‌سەید حەســەن لە زمانی خودی سەید حەسەنەوە دەنووسێ . بەلاّم ئەم شەجەرەی دواییە لەگەلّ هی خۆی و هی دوکتۆر موکری یەکتر ناگرێتەوە . دەقی شەجەرەکەی سەید حەسەن لــە زمانی خۆیەوە ئەمەیە :

بسم الله الرحمن الرحیم

الحمدلله علی ان من علینا حیث جعلنا بمحض فضله الجمیل و کرمه الجزیل غیر آل انتسب للاولیاء ، و جعل حسبنا بحس لطفه الکامل، و بتوفیقه الشامل اتباع سنه افضل اجدادنا اعز خلق الله الی الله تعالــی محمد المصطفی ـ ص ـ .

فانا الفقیر حسن الجوری ، ابن المرحوم السیـد عبدالقادر، ابن السید ابراهیم ، ابن السیدعبدالرحمن ابن ابراهیم المعروف اولا بمیرزا ابراهیم و ثانیـا بملا میرزا ، ابن السید عبدالغفار، ابن السیدابراهیم ابن السید حسن المشهور بالمصنف، المسکن بابی بکر.

( ٥ ) ١١٩٥ ـ ١٢٨٣ ی. کۆچی .

ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی

# ئەحمەدی شەنگ

ئەوە سەرێکە من دێشێ ،
دلێکە منی چەندی لەگری و چەندی لەژانە ،
ئەوە دایکێ ئەحمەدی شەنگ ،
دەچۆوە سەر بورجێکە منەوەر .
دووربینەکە خۆی دەهاویشتەوە .
هەر لە ئێرانە هەتا وەکوو توورانە ،
خەبەرچیان خەبەری خۆیان ،
دە کووچە و محەلی شاری دەگێڕانە .
ئەوە دایکێ ئەحمەدی شەنگ بانگ دێلێ :

- رۆڵە ئەحمەدە ئەحمەدە گیانە !
- ئەتوو نەتزانیوە ئەورۆ حەوت رۆژە ،
- گاڕان و ماڵی تۆیان دەبردەوە بە تالانە .
- فەرسەخ بە فەرسەخ ، قۆناخ بە قۆناخ
دەئاژوانە .
- سەرکردەی ئەوێ لەشکرێ ،
- خانی سەیان گێلان گێسەیانە ،
ئەحمەدی شەنگ بانگ دەکات :
- ئەرێ دایە ! چەکان بێننە بەر بێلایە .

- سبحەینێ شەڕە دەگەڵ ئەوێ دەعوایە.
- خۆ من خەمی ئەوەم نیە،
- گاڕانی منیان دەبردەوە بە تالان.
- فەرسەخ بە فەرسەخ،
- قۆناخ بە قۆناخ دە ئاژوایە.
- من خەمی ئەوەمە،
- ئەورۆ کە حەوت رۆژە،
- سەری گاوانی ئەحمەدی شەنگیان دەبڕی.
- دەکەوتەوە لە دەشتەکێ لە سەحرایە.
ئەحمەدی شەنگ بانگ دەکاتێ:
- وەرە فەرەجێ فەرەج خاتوونە.
- لەپێشم رابڕە بەزینە.
- لەیلکم لە تەویلە و یەخترمەخانێ بۆ دەربینە.
- زینێکە موڕسەلی لە پشتی بەشە تینە.
- جووتێکم دەمانجان بە قەلپووزی زینی داینە.
- رمبێ نەزەریم،
- لە کەونە رەشمالێ بۆ دەربینە.
- ئەرێ ژنێ ئەتووحەلاڵی منی.
- بە دەستێکت بگرەوە رمبێ،
- بە دەستی دی رکێفی من دابگری.
- ئەوان دووسەت و پەنجا سوارن
- سێسەت و پەنجا سواری دیکەشیان
- بێتە گەلێ،
بە حەول و قەوەتی خودای،
بەتەنێیان دەچمێ.
ئەوە ئەحمەدی شەنگ بە توندی بە گوڕی
لە لەیلکێ دەخوڕی:
لەیلک لێی وەزمان دەهات،
دەیگوت: ها خانە خراپ
- وەختە بسۆزێ بەردی عەبدولعەزیزی.
- ئەتۆ پێت وایە من چ گۆلە بارگینێکم،
بە نووکی دەفسۆزێ.
- کە لەکێ منت دەدری،
- ئەمن بە پاشوان فڕێم دەدایە گری
دە ئاوری.

- بە پێشوان خۆم فڕێ دەداوە
بە گوڕی.
- رێگای حەوت شەو و حەوت رۆژان،
- بە دانێکیم بۆ تۆ دەبڕی.
- دەچوومە پێدەشتی خانی،
- سەیان گێلان گێسەیان،
- ئەوە یەک بە یەک نۆرە بە نۆرە،
- لەسەر خوانی زینیت دادەبڕی.
دووێان دەردەچوون،
یەکیان بە خوارزا.
ئەوی دیکەشیان بە بەرپێی
لەیلکێت دەبەخشی.
ئەوە خوارزای ئەحمەدێ شەنگ
بانگ دێلێ هۆی خالە!
وەرە با بە جووتە جووتە سوار بین،
بزانین چیان پێدەکەین بەو حیزانە.
ئەوە ئەحمەدێ شەنگ،
زگی بە خوارزای خۆی دەسۆزا.
پیلی دەگرت و
دەیاویشتەوە پاشکۆیە خۆی.
لە پشتەوەڕا قەرەبینایەکی لە ئەحمەدێ شەنگ دەداوە.
بەسەر یالێ و بژی لەیلکێ دا بەردەداوە.
سواری لەیلکێ، تاقانەی دایکێ
دەک دایک لەبۆت نەمێنی،
لەبۆ تاقە سێوەکەی سەرلکێ.
بەجێ دەمای لە ولاتی غەریبیان بەتەنێ.
ئەحمەدێ شەنگ بانگ دێلێ:
سەرێکە من دێشێ و دلێکە منی
چەندی لەگری و چەندی لە گژی گژی.
ئەوە کێ دیویەتی لە دەورەتی دەزمانان،
خوارزا خالێ خۆ بگوژی.
خوارزا ئەحمەدی شەنگ بانگ دێلێ:
سەرێکە من دێشێ و دلێکە منی
چەندی لەگری و چەندی لە گژی گژی
ئەوە مەرد هەر ئەو مەردەیە،
دوژمنی خۆی بە فێلێ و تەڵەکان.

لە گۆشەی مەیدانێ دا بگوزێ.
سواری لەیلکێ تاقانەی دایکی ،
دەک دایک لەبۆت نەمێنێ ،
لە بۆ تاقە سێوەکەی سەر لکێ .
بەجێ دەمای لە ولاتی غەریبیان بەتەنێ،
ئەوە دەورەی لەیلکێیان دەداوە ،
لەیلک یالّ و بژی دەناوە دەخوێناوێ ،
دەورەی لەیلکیان دەداوە.
لەیلک ئەو سەفی رووی تێدەکردن ،
خەزای لێ دەکردنەوە تەواوە.
هیندێکان دەیانگوت:
ئەوە ئەحمەدێ شەنگە و هەرگیز نەگوزراوە
لەیلک کەرتی دەکردەوە لغاوە ،
دەردەپەرێ ،
لە گەلێک جێیان دەرۆیی بە یورتمە ،
لە گەلێک جێیان دەرۆیی بە سەرراوە.
خەبەری بۆ مالّە کۆسەوەتمانان دێناوە ،
دایکی ئەحمەدێ شەنگ ،
دەچۆوە سەر بورجێکە مندەوەر،
دووربینەکە خۆی داویشتە لای رۆژئاوایە ،
تەمەشای دەکرد.
دوور تۆزو غومارێک دیارە .
دەیگوت سەلاو سەد سەلای گەورەو
گرانم لێ رابوو ،
ئەوە ئەحمەدێ شەنگەیان بریندارە ،
یا نەگوزراوە.
سواری لەیلکێ ، تاقانەی دایکێ ،
دەک دایک لەبۆت نەمێنێ !
لە بۆ تاقە سێوەکەی سەر لکێ ،
بەجێ دەمایەوە لە ولاتی غەریبیان بەتەنێ،
دایکی ئەحمەدێ شەنگ بانگ دێلێ :
هۆی کاشام ئاغا !
کاشام ئاغای دەردێن شینە !
ئەتۆ هەروو تۆلّەی ئەحمەدیم لەبۆ بستینە .
ئەو نیازی ئەتۆ لەسەری،
لەکنە من حاسلّ دەبێ ،
هەر لەکنە من دەبێتەوە بە یەقینە.

ئەوە کاشام ئاغا بانگ دێلێ :
دە لە پێشم رابرن بەزینە .
لەیلکم لە تەویلە و یەختر مەخانەی
بۆ دەربینە .
زینێکە موسەلی لەپشتی بشەتینە.
جووتێکم دەمانچان
بۆ بە قەلّپووزی زینی دابینە.
رمبی نەزەریم
لە کەونە رەشمالّان بۆ دەربینە ،
بابە ئەی لەبەر کاشام ئاغای
لە گەلێک جێیان دەیکردەوە هەلّلایە ،
دەچۆوە پێشێ لە لەشکری
خانی سەیان گێلان گێسەیان.
سێسەت و پەنجا سواری لێ فرێدەدان،
هەر لەوی وایە توورەکێکە لەوی دەکایە .
کاشام ئاغا بانگ دێلێ :
کێ بوو ئەحمەدێ شەنگی دەگوزت ؟
خوارزا ئەحمەدێ شەنگ بانگ دێلێ :
هەر ئەمن بووم بە دەستی خۆم ،
پشتی خۆم دەشکاند .
هەر ئەمن بووم بە دەستی خۆم ،
جەرگی خۆم دەبرییە.
ئەوە کاشام ئاغا بانگ دێلێ :
ئەمن گوێم گرانن.
گوێم لەوان قسانە نیە.
وەرە پێشێ بزانم جواب و سوالی تۆ چیە؟
دەهاتەوە پێشێ ،
قەرەبینایەکی لە خوارزا ئەحمەدێ شەنگ
دەداوە .
دمی دەناوە بە خوێناوی.
دەیگوت ئۆخەی سوکنایی دلّم دەهات ،
وەدەزانم ئەحمەدێ شەنگ هەرگیز نەگوزراوە.
سواری لەیلکێ تاقانەی دایکێ،
دەک دایک لەبۆت نەمێنێ !
لە بۆ سێوە سوورەکەی سەر لکێ !
بەجێ دەمای لە ولاتی غەریبیان بەتەنێ !

نووسینی
عبدالخالق محمد حموی قرنی

**کانی یەکانی سەقز :**
**رەجەب ـ کۆنەسەقز**
**کانی باغ ـ مزگەوتەچکۆلە**
**کانی باغی خان کانی قوشقانە**
**کانی هەیاس بەگ ـ کانی**
**کەلانتەر ـ کانی بەردینە** ،کە لەمەوپێش ئاوی خەڵکیسەقزیان دابین دەکرد .

**بایەکان :**

رەوەندی رۆژاوای ، **ئۆقیانووسی گەورە** (لە **میدیتەرانە ـ دەریای رەش** ـ ، **ئیسکاندیناوی** ) زستانان رەوەندی ئۆقیانووسی گەورە بۆ **ئێران** زۆرگرینگن . ئەم رەوەندانە چ **لەدەریای رەشەوە** چ **لە میدیتەرانەوە** چ لە باکووری رۆژاوای **ئیسکاندیناوییەوە** تەئسیرێکی زۆر لە ئاو وهەوای زوربەی خاکی ئێران دەکەن، بەتایبەتی بۆکشت وکاڵ زۆر پێویستن. رەوەندەکانی رۆژاوا تا نێوەراستی بەهار بەرەو رۆژهەڵات دەبزوون و هاوینان تەقریبەن دەبڕێنەوە .

ئەم رەوەندە شەدارانەلە ئێران لەرەوەندەساردەکانی **سیبری** و نێوەندی **ئاسیا** و باکووری رۆژاوا هەڵدەنگوون و دەبنە هۆی بارینی بەفر و باران چونکە سەرچاوەی بارینی زستانی رۆژاوای ئێران **ئۆقیانووسی گەورە** و **دەریای میدیتەرانەن.**

رێبازی رەوەندەکە جەنووبیترە . ئەو رەوەندە بەرەو **خەلیجی فارس** دەچێ هێندێک لقی لێ جیا دەبێتەوە ودێتە **ئێران** و دوای ئەمە بەشێکی ئەم رەوەندە بەرەو جەنووب پێچ دەکاتەوە و روو لە **باختەران** دەکا، لەوێ پێی دەڵێن"**بای زەلان**" یا "**چەپبا**" بەشێکیش لە رۆژاواوە دێتە ئەم هەرێمە بە "**کەللـەبا**" مەشهوورە .

**شەماڵ :**

سەرچاوەی ئەم بایە **میدیتەرانەیە** و لقێکە لەو بایانەی لەسەر **میدیتەرانەوە** بەرەو رۆژهەڵات و جەنووبی رۆژهەڵات هەڵدەکەن.

بای شەماڵ دوای ئەوەی گەیشتە چیاکانی سنوور شان بەشانی کێوەکان لە جنووبی روژاواوە روو وە باکوور هەڵدەکشێ و لە سەرانسەری مەڵبەندەکە بەم شوێنەدا دەڕوا .

**شەماڵ لە نووچگەی کێوی نەکەرۆز**
**هێنایە سەقز پەیامی نەورۆز**
**وتی ئەم جەژنەیکاوە و فەرەیدوون**
**لە کوردانی پاک پیرۆزبێ پیرۆز**
**( شێخ نافیعی مەزهەر)**

**زریان :**

رەوەندی ئەم بایەبەپێچەوانەی بای **شەماڵ**، رووی لەباکووری رۆژهەڵات ،جەنووب ، جەنووبی رۆژاوایە . بەتەحقیق دەرکەوتووە سەرچاوەی ئەم بایە ئەوشاری هەوایەکە زستانان لە **سیبری** بەدی دێ وئەندازەی دەگاتە ۷۷۵میلیمیتر ، چونکە لەم کاتەدا **دەریای خەزەر (قەزوێن،کاسپیەن)** ئەو شاریکی کەمتری لەسەرە رووی تێدەکاو بەرەو جەنووبی

رۆژاوا دەڕوا و ئەمە هەرئەو
بایەیلە تەوریزو زۆرشوێنی
ئازەربایجان بایمەدەی پێی
دەڵێن : ئەم جەرەیانە لە
دەوروبەری دەریاچەی ورمێ
مەسیرەکەی دەگۆڕێ و لەبەر
زنجیرە چیاکانی سنوور و
چیاکانی کوردستان بەرەجنووب
و جەنووبی رۆژاوا بادەداتەوە
وناوی دەبێ بە زریان.

**گیاندارەکان :**

گیانداری وەحشی وزەرندە
لەسەقز زۆر کەمەو تەقریبەن
نادرە . لەوانەی تا ئێستا
کەوی نەبوون وسەربەخۆ دەژین
دەتوانین **ورچ و بزنەکێوی**
**وئاسک وبەراز وکەروێشک**
**و چەقەڵ وگورگ و رێوی**
ناو بەرین ژمارەیان زۆرە و
لە هەموو جێیەکی سەقز هەن.
**ورچ** دوورە پەرێز وگۆشەگیرە و
لە نێو ئەشکەوت و لە دوندی
کێوە بەرزەکان دەژی. بەڵام
**بزنەکێوی و ئاسک** زۆرن ولە
هەموو شوێنێکی ئەم مەڵبەندە
بە تایبەتی لەبەشی سەرشیو و
دەور و بەری چیای **چل چەمە**
هەن . بەراز زیانی خورۆیە
و ملۆزم و ئافەتی باغ ودارو
باری ئەم مەڵبەندەیە .
باڵندەی ئەم مەڵبەندە زۆرو
جۆربەجۆرن : پەرەسیلکە
**باشوو، کوڕکوڕ، کەو**
**پەپووسلێمانکە ، کوندەبوو**
**چێرگ ،بۆرچین، هەڵۆ ، شوان**
**خەڵەتێنە، داڵ، قشقەڵە**
**سێروو، کاسەڵکە شینە، قەل ،**
**کەندەسمە، سۆنە ، فیسقە**
**ریشۆڵێ، شەهێن، شمقار ، سەقر**
**زڕەکەو ، کۆترەباریکە ،قاژوو**
**گاکۆتر ،جوربۆرە ، باز ،پاساری**
**حاجی لەق لەق ،مریشک ،شیرین**
**شاهۆ ،عەینەمەلە ،مشک گرە ....**

گیانداری کەوی : **ئەسپ**
**وشتر ، مانگا ، بزن، مەڕ ،**
**گامێش، سەگ، پشیلە ، ......**

**خەزندە :**

ماری زەرندە زۆر کەمن
تەنیا لە چیا دوورەدەستەکان
ئەویش زۆر کەم بەرچاو
دەکەون ماری ئاوکە بێ
ئازارە ، زۆرە . دووپشکی
ئەم مەڵبەندە زەردو زەعیفن
و زۆرکەم دیارن.ئەنواعی
حەشەرەو پەپوولەش لەم
مەڵبەندە هەن .

**ژمارەی خێزانەکانی ساڵی ٦٢ بە ئاماری تەخمینی بەخشداری سەقز**

| | | |
|---|---|---|
| تورجان | ٤٣٠١ | خێزان |
| تیلەکۆ | ٧١٤٦ | = |
| خوڕخوڕە | ٢٢٤٥ | = |
| سەرشیو | ٧٠٧٤ | = |
| کولتەپە | ٤٩٠٥٠ | = |
| مەرخوز | ١٥٧٤ | = |
| میرەدێ | ٩٢٤ | = |

**ئاماری ژمارەی قوتابییەکانی ساڵی ٦٣-٦٢ ی شارستانی سەقز :(٢)**

**ژمارەی هەموو قوتابییەکانی ئیبتیدایی ١١٣٠١ کەس**
**ژمارەی هەموو قوتابییەکانی ئیبتیدایی شاری سەقز**
**٧٣٧٤ کەس**
**ژمارەی هەموو قوتابییەکانی**

تایبەتە ئینسانییەکان سەقز
نفووسی شارستانی سەقز
١٤١٠٠٠ کەس
نفووسی گوندەکان
٦٠٠٠٠ کەس
نفووسی شاری سەقز
٨١٠٠٠ کەس

ئیبتیدایی گوندەکان
**٣٩٢٧ کەس**
ژمارەی قوتابییەکانی راهنمایی شار ٢٥١٣ کەس
= = گوند ٩٦ =
ژمارەی مەدرەسەی کوڕانەی شار ٦ دەست

ژمارەی مەدرەسەی کچانەی شار ۳ دەست
ژمارەی مەدرەسەی گوندەکانی شار ۳ دەست
ژمارەی مەدرەسەی شەوانەی راهنمایی شار ۲ دەست بە ۲۱۷ کەس قوتابی یەوە
ژمارەی دەبیرستانەکانی شاری سەقز ۵ دەست ۲ی کچانە و ۳ ی کورانە

ژمارەی قوتابی یەکانی ئیبتیدایی ۱۵۴۵۹ کەس
ژمارەی قوتابی یەکانی ئیبتیدایی گوند ۹۷۸۷ کەس
چوار دەست کودەکستانی شار ۷۳۰ کەس
ژمارەی قوتابی یەکانی راهنمایی شار ۲۱۷۴ کەس
ژمارەی مەدرەسەکانی راهنمایی گوند وشار ۱۰ دەست ، ۶ دەست

قوتابی یەکانی هونەرستان ۵۸۳ کەس
قوتابی یەکانی هونەرستان شەوانە ۲۹۷ کەس .

زمان :
زمانی خەڵکی سەقز کوردی یە و لەهجەیان نێوەندی یە ئەم لەهجەیە تایبەتی جنووبی رۆژهەڵاتی کوردستانە یانی زوربەی کوردەکانی کوردستانی عێراق لە رەواندزەوە بۆ جەنووب و کوردەکانی جەنووبی دەریاچەی ورمێ لە ئێران ، بەم لەهجەیە قسە دەکەن لەوە تا زمانی کوردی لە تورکیا وسووریا قەدەغە کراوە ، بەهۆی بووژانەوەی کوردی عێراق ، لەهجەی نێوەندە بەسەر لەهجەی شیمالدا زاڵ بووە و ئێستا لەهجەی ئەدەبی یە.
زمانی کوردی لە ئێران و عێراق بە ئەلف وبێی عەرەبی لە سووریا بە ئەلف وبێی لاتینی ، لە یەکێتی سوڤیەت بە ئەلف وبێی رووسی دەنووسرێ .

ژمارەی قوتابی دبیرستانەکان ۱۳۱۰ کەس ، فەننی و حیرفەیی ۲۶۲ کەس
دەستێک هونەرستان ۲۳۲ گوند ویسعەتی مەڵبەندەکە ۵۱۱۰ کیلومیتری چوار گۆشە .
نێوانی دوورترین دێ دەگەڵ شار ۱۱۰ کیلومیترە خاوەنی مەدرەسە .
ژمارەی نوێنەرەکانی ئامووزش و پەروەرشی هەرسێک بەش ئاماری نفووسی شارستانی سەقز و ژمارەی قوتابی یەکان و ژمارەی مەدرەسەکان بەئاماری ساڵی ۱۳۵۸ و ۱۳۵۷
نفووسی ناوچەی شارودێ ۱۱۲/۴۴۶ کەس

شارە و ۴دەست ئی گوندان
ژمارەی قوتابی یەکانی دەبیرستانەکانی شار ۳۴۱۵ کەس
ژمارەی دەبیرستانە عموومی یەکان ۴ دەست .
دەستێک دانیشسەرای موقەدەماتی - دەستێک ئی خەدەمات

# پیره‌دار

سه‌لاحی عه‌ره‌بی

ئاخر و ئۆخری پایزه، گزه بای تووره وه‌ک داره‌وانی رق هه‌ستاو ملی ناوه‌ته قۆوله و هه‌را، هه‌رجاره شالاو بۆ لایه‌ک ده‌باو به‌چڕنووکی تیژ و دزێوی سه‌روپرچی داره‌کان ده‌رنێته‌وه؛

هه‌رگه‌لایه‌ک به‌نا به‌دلی خه‌ریکی مال ئاوایی ده‌گه‌ل لق و پۆپانه، ترساوو ره‌نگ بزرکاوله هێرشی باکه‌وتۆته له‌رزین، وه‌هاله‌رزینێک که هۆی تێدا چوون و سه‌ر هه‌لپسانیه‌تی.

پیره داری رووت و قووتی ته‌نیای سه‌رکانی، به‌ئارامی راده‌ژێ! وێنه‌ی قه‌لافه‌تی چه‌میوی له نێو چاوه‌ی مات و بێده‌نگدا دیمه‌نی راسته‌ـ قینه‌ی وه‌رزی زه‌ردی ته‌مه‌ن ده‌نوێنێ!

خۆله‌میشی ئاورگی سڕ هه‌ر تاوه نا تاوێک شینگلێک له خۆی ده‌دا و ده‌بێته تۆڕ و به سه‌ر نیگای گه‌شیکانی ده‌کشێ و لێلی ده‌کا. ده‌سمالی ناسکی هه‌وریی ئاسمان تارای ره‌شی رووی هه‌تاوه!

به‌لام هه‌رکه بالینگی دایه، گه‌وه و شیرازه‌ی ده‌ست لێک به‌ر ده‌ده‌ن، تیتۆل وریشالی به هه‌زار پینه وپه‌ڕۆ و ته‌قه‌لان ناچێته‌وه سه‌ر یه‌ک. سه‌رله‌نوێ خۆربه‌دی ده‌کرێ و هه‌ور بۆ هه‌میشه ناتوانێ رووم‌ه‌تی بشارێته‌وه! هه‌ور ده‌توێته‌وه و ده‌بێته فرمێسک و په‌نا بۆ زه‌وی دێنێ....!

به‌لێ داوێنی پاک وزێڕینی رۆژ په‌له‌ی پێوه نامێنێ، ئه‌و په‌ڕۆ شینه ده‌بێته په‌له‌ی دلخۆشی له زه‌وی دا.

پایزی ئه‌و سال هه‌والی هاتنی زستانێکی ساردی پێیه، ته‌زووی سه‌رما له‌ئێستاوه پیاو ده‌ته‌زێنێ.

هه‌ر وه‌ک هه‌موو دارێک پیره‌داریش خه‌ریکه‌مل بنێ له خه‌وێ،وێژینگان ده‌دا وئێستا خه‌و به‌باشی سواری سه‌ری نه‌بووه.

زستانان هه‌تاو هێرش بۆ رێبواران ناهێنێ هه‌تا خۆ بخه‌نه بن سێبه‌ری فێنکی و بحه‌سێنه‌وه! ئه‌وه‌ش ده‌زانێ که له‌و به‌ری سنووری پایزو زستاندا وه‌رزی چرۆ وگه‌لا خۆی حاشار داوه.

هه‌ر بۆیه‌ش دلنیا و دلخۆشه که ئه‌و وه‌رزانه‌ش بنه‌بڕ ده‌بن وبنه‌گر نابن!

چه‌ند رۆژیکی دی تێپه‌ڕی داره‌کان خه‌ویان لێ که‌وت و پیره داریش هه‌رواتر.

سه‌رما یه‌کجاره‌کی ولاتی داگرت. زستانه‌وبێ‌ده‌ره‌تانه.

رێبواره‌کان تاق وازتیژ به په‌نایدا راده‌برن وبێ ئه‌وه‌ی سه‌رنجی بده‌نێ تێپه‌ڕ ده‌بن.

ئه‌ویش چاوی لێیه‌و له به‌حری خه‌ماندا خه‌م ده‌خوا.

به‌لام خۆچ ده‌نگی لێ وه‌نایه، گه‌لێکی وای دیوه، سواوه،ئاخر ئه‌و هاتن وچوونه هه‌رکاری ئه‌وسال نیه...!

خۆی ده‌زانێ پایز و زستانان هه‌تاو هێرش بۆ

خه‌لک له‌ترسان ده‌گه‌یشتنه‌به‌ر ده‌وه‌نێکی ده‌یانبڕی و ده‌رخواردی سۆبه‌یان ده‌دا.

ئاغای دێ له‌گه‌ل ئه‌وه‌ی سووته‌مه‌نیه‌کی زۆری داخستبوو ته‌واوی ولاتی ئاخنیبوو،چونکه ئه‌وه‌نده چاو برسی وبه‌ته‌ماح بوو، ده‌نۆکه‌رانی راخوڕی پیره‌داری سه‌رکانیش ببڕن و بیهێننه‌وه! نۆکه‌ریش بێ راوه ستان ده‌ستیان دابیور

ومشار و بەرەو شوێنی دیاری کراو رێکەوتن .

حوکمی حاکم وەهای تین دا بوون،خێرایەکی گەیشتنە سەری. نێوی خودا و رەسوولانیان هێنا و قۆڵیان لێ هەڵماڵی و کەوتنە گیانی ، بەزەبری هەوەڵین بیور پیرەدار وەخەبەر هات ...!

تێپەڕینی پایز وزستان و هاتنی بەهار هەموو خەون و خەیاڵ بووا!

لەماوەی دووجگەرەکێشاندا عارەبە وهێنایانەوە .

لەبەر دەروازەی ماڵی ئاغا بە عەرزیاندا داوهەرئەوێ رۆژێ هۆرەیان لەخۆی بۆتاشی و قەڵت وبڕیان کرد .

پیرەداریان لەقولینچکێکی هۆدەی ئاوردوودا بەلیزە دانا ، هەتاباش وشک بێ و ئەگەر هاتوو سووتەمەنی بەشی نەکرد لەگەڵ ویشکەڵان ببێتە دەستە چیلەی سۆبە .

بەڵام خودا وراستان ئەوێ ساڵێ پیرەدار نۆرەی نەهات پیرەدار .

بەڵام هەر ئەوەدەم دەستیان لێ نەدا با باشتر بووا!؟ هەر جارێک ئاوریان بەلاشەی لەت و پەتیەوە دەنا دەستی دەکرد بە قرچ وهۆڕ و ئاورینگی دەدا .

وادەسووتا و پۆلووی لێ دەکەوتەوە ، کوورە دەبوو بەدندووکی کەوێ!

گڕ لەنێو قۆڵە کوورەدا تەندوورەی دەکرد وچەشنی کۆڵەکە سەری بەمیچەوە دەساوی .

هەدای نەداو ئۆقرەی نەگرت ، زمانی کێشاو بە کەلەکەی ژنگاوی ودابێژراوی قۆڵە کوورەدا خۆی لەقامیش و هەڵاشی هاڵاند ، لەلایەکی دیکەشەوە سکڵ بەزارکی خەفەنگدا دەر پەڕی .

سووتمان گەوتە قەڵایە ، سووتمانێکی هێندە گەورەو بەسام کەتەلاری لیپاولیپ لە بێ روحمی و دڵرەقی ، یانی باشتر بڵێن مەکۆگەی زۆری تێک تەپاند .

کەلاکیان خست ،قژ ولق و پۆپیان پەڕاندو بەژنیان رووتاندەوە و مووروە مووروەیان کرد .

کەڵ دەنگ دران وعارەبەیان رەکێش کرد ،بەلەقەلەق وجیرە جیڕ چوونە سەرمەیتی لەت و پەتی پیرەدار، تێیڕۆهاتن و خێرایەکی خستیانە سەربانی و نەسووتێندرا .

بەهار هات و هاوین رۆیی و گەڵا وەرین و دیسان سەرما گەڕایەوە .

سۆبە خاوێن کرانەوە و قۆڵیان تێهەڵکێشرا وبوونەوە سەرما رەتێن و خۆشەویست .

دیسان کوورەی ئاغا نێڵ درا و وەگرفە کەوت و نۆبەگەیشتە

# ڕەخنە و

**نیە لە مومکینێ ئیمکان خەتا و سەهوی نەبێ**
**بە غەیری خاجەیی دیوانی ( عالم الاسما )**

**لەم بەشەدا کە زۆریش سەرنجی خوێنەرانی بەڕێزی ڕاکێشاوە دوو مەبەستمان لەبەرچاوە : یەکەم: ئەوەی کە بە هاوکاری هەموو خوێنەرە بەئەمەگەکانمان هەڵەی ژمارەکانی ڕابردوو ڕاست بکرێتەوە . دووەم : پێشنیاری خوێنەر بە هەموو ئەو کەسانەی کە بۆسروە دەنووسن یا دەیانەوێ بنووسن ڕاگەیەندرێ . لە ڕاستیدا ئەم لاپەڕە دەبێتە هۆی پەیوەندی گرتنی خوێنەرانی سروە و ئەو نووسەرانەی لە دوور و نزیکەوە شت بۆ سروە دەنووسن .**

گوندی کیسەڵانی سەقز : **ماموستا مەلامەحموودی ابن الخیاط**

پێشتر کتێبی "دوران بی خبری " نووسراوی برادەری دڵسۆز "ڕەشیدیکەیخوسرەوی" م خوێندبۆوە .کاتێک لەسروەی ژمارە ٣ دا جوغرافیای شارستانی سەقزیشم خوێندەوە، دیم لەسەر قەڵای گوندی زێویە و ئەشکەوتی کەرەفتوو و قەپلانتوو (ئاراماییت) ،کە هەرسێیان شوێنەواری بەجێماو لەسەردەمی مادەکان بوون و دانیشتووانیان لەیەک نەتەوە بووە ، باس کراوە .بەڵام بەداخەوە هیچ ناوێکیان لە قەڵای سوولاکان نەبردووە .

چونکوو خۆم لەو گوندە لە دایک بووم وکەم تاکورتێک لەسەر قەڵاکەی ئاگاداریم هەیە ، ئەوەی دەیزانم دەینووسم . بەوهیوایەیزیاتر بکەوێتە بەرسەرنجی ئەوانەی لەسەر شارستانیەت وجوغرافیا و مێژووی وڵاتەکەمان تەحقیق دەکەن .

گوندیسوولاکان لەپازدە کیلۆمیتری ڕۆژهەڵاتی زێویە و لەنێوان ئەم گوندە و ئەشکەوتی کەرفتوودا هەڵکەوتووە .قەپلانتوویش دەکەوێتە جنووبی ڕۆژاوایی سوولاکان .

لەسوولاکاندا دوو قەڵاهەیە کەناویان قەڵای سەروو وقەڵای خواروو‌ە .لەنێوان هەردوو قەڵاکەدا دوو گۆڕستان هەیە کەئاسەواری خانووبەرەی رووخاوی تێدا دۆزراوەتەوە . لەنێو ئەو کاولانەدا چەندین جار ئاقیق و لەتکە سواڵەتی نووسراو دۆزراوەتەوە .

هەرچەند تائێستاکاری لە سەر نەکراوە ،بەڵام پێموایە ئەگەر بەشێوەیەکی ئوسوولی بکەوێتە بەر لێکۆڵینەوە گرینگییەکی کەمتری لە قەڵای زێویە نابێ . قەڵای سەروو کە شوێنەواری خانووبەرەی رووخاوی لێیە بەردێکی زۆر بڵیندە کەبڵیندایییەکەی بیست تا بیست وپێنج میترێک دەبێ و لە نێوەڕاستیدا هەیوانێک داتاشراوە کەبە پلیکان بۆی سەر دەکەون .

لەقەدیمەوە پێی دەڵێن "تاقەجانە "یا "تاقەجوانە "یا "تاقچە" . پیرەپیاوان دەیانگوت ئەم قەڵا وقەڵاکەی زێویە شاری کوردان بوون و لەشەڕ لەگەڵ دراوسێکاندا لە نێو چوون .بەڵام دوورنیە کە قەڵای سوولاکانیش هەروەک ، لە "تاریخی مەرد وٚخ"و"دوران بیخبری "دا بۆزێویەنووسراوە بە بوولەرزە لەنێو چووبێ .

پێشنیارێکیشم ئەوەیە ،کە لەهەر ژمارەیەکدا باسی یەکێک لە زانایانی ئاینی بکەن تا گۆوارەکە لەیادی زانائاینییەکان و دەستوورە بەکەلکەکانی مەزهەبی دوور نەبێ .

دیواندەرە :**کاک سەعید خوسرەو**

مانای وشە سەختەکان لە ژێر هەر مەقالەیەکدا بە زمانێکی ئاسان بنووسن .

ئەگەر دەتوانن فەرهەنگی لوغەتێکی بەکەلک چاپ بکەن.

دیواندەرە :کاک خەلیلی عبداللهی

وێنەی رەنگی لە تەبیعەتی کوردستان و شوێنەوارە کۆنەکانی ئەم مەڵبەندە لەسروەدا چاپبکرێ

نەخشەیەکی تەواو لە کوردستانی ئێران کەوەزعی تەبیعی ئەم ناوچە نیشان بدا لە چاپ بدرێ.

فۆلکلۆری ئەدەبی کوردی هەموو ناوچەکانی کوردستان بڵاوبکرێتەوە

باسی بێهداشت وناوی گژو گیای کوردستان

ناساندنی کتێبە کوردییەکان ونووسەرانی ئەو کتێبانە

ئەگەر لەباری ماڵییەوە تەنگ و چەڵەمەیەکتان لە پێشدایە نرخی گۆوارەکەزیاتر بکەن ، چونکوو نێوەرۆکی پڕبایەخی سروە لەگەڵنرخەکەی رێک ناکەوێ .

پیرانشار : کاک خدری ئیسماعیلی

لەسەر رووداوە گرینگە کۆمەڵایەتی و ئەدەبییەکان، کوردناسەکان ،کوردینووسەکان ، پتر بنووسن و ژیانی تاڵی ئەم گەلە هەژارەزیاتر بخەنە بەرباس .

سەردەشت :کاک ئەحمەدی ئیبراهیمی

١ ـ گۆواری سروە بکرێ بەمانگانە

٢ ـ لەبارەی قورئانی پیرۆزدا لە هەر ژمارەیەکدا شتێک بنووسرێ .

٣ ـ ئەگەر ئیمکانی هەبێ لە هەر ژمارەیەکی سروەدا چەند حەدیسی چاک لە چەند راوی باوەڕپێکراوی ئەهلی سوننەت چاپ بکرێ .

٤ ـ لەبارەی مەسایلی کۆمەڵایەتی دا (جێژن،ئازیەتباری ، ژن بە ژنە ،مارەیی چوونەسەر قەبران ،دەروێش و ...) مەتالبێک بنووسن .

٥ ـ هەواڵدەرێکتان لەناو شارەکوردەکان هەبێ .

گوندیبرایم ئاوای میاندواو :کاک قادر پەروین

ئەگەر دەتوانن بەسەرهات و ژیاننامەی شاعیری مەزن ماموستا هەژار لەسروەدا بنووسن .

نەغەدە :کاک جەببار خوشناو

شیعری نوێ سەرنجێکی زیاتری بدرێتێ .

عەلیئابادی بۆکان : کاک حەمەدەمینی حەمیدی

چەند لاپەڕێک بۆ لێکدانەوەی گیروگرفتی گوندنشینەکان و وەزعی ژیانیان دابنێن . لەبارەی بێهداشت و ئاو وبەرق و کشت و کاڵی گوندەکانەوەبنووسرێ.

مەهاباد :کاک یەحیا عەسکەری

لاپەڕێک لەسروە بۆحەدیس و ئایاتێک لە قورئانی پیرۆز دابنێن کە ئۆمەتی موسڵمانی بۆ خوێندن و بارهێنانهان داوە .

باسی مێژوو و کارەساتە مێژووییەکانی کوردستان وەک قەڵای دمدم و دریاز ، فەقرەقا ، بیستوون و........ پێویستە .

چۆنیەتی هاتنی ئیسلام بۆ کوردستان ،ژیاننامەی حەزرەتی محەممەد (دخ) و چۆنیەتی بە خەلافەتگەیشتنی خولەفای راشیدین و ژیاننامەو کردەوەکانیان لەهەر ژمارەیەکی سروەدا چاپ بکرێ .

گوندی داشبەندی بۆکان : کاک سەیدکەماڵی لەتیفی قورمیش

دەبینم کە زۆرتری نێوەرۆکی گۆوارەکە باسی پێشینانە . جاهیوادارم لە مەودوا لەسەر کەندو کۆسپ و گیرو گرفتەکانی ئێستای کوردستان بدوێن .

لاپەڕەی "لەگەڵ شیعری شاعیرانی لاو" زیاتر بکرێ

لەباسی جوغرافیایشارستانی سەقز لاپەڕی ٢٦دا گوتراوە گوندی داشبەند لەشەش کیلۆمیتری میاندواو دایە . داشبەند لەمیاندواودوورترە و پازدەکیلۆمیتر لەبۆکان دوورە .

شاعیرانی کورد

# سوارە

عەزیزی کەیخوسرەوی

لە تاریکی وشەوەزەنگی ساماناک وپڕ مەترسیدا ،کە ئاڵی زاڵی شەو وەک گەڵای داری خەزەڵوەر چەموڵەی کلۆڵی وچارەڕەشی لە خەڵکی وڵاتەکەمان نابوو،ئەستێرەیەکی پڕ تریفە لە ئاسمانی هونەر وئەدەبیاتی کوردەواریدا ئەنگووت.شاعیرێکی خاوەن هەستکە وەک ئەستێرەیەک بە تیشکی جوانی خۆی پەردەی شەوەزەنگی هەڵدڕی و لە زەنوێری زێڕئاژنی سای زرینگانەوەی شەو بە خوڕ زەمزەمەی هەڵبڕی. شیعرە جوانەکانی کە گرمتر لە پڕشنگی تاوی بەهاری و بە تینتر لە روانینی بە تاو تینی زاوا و ناسکتر لە روومەتی بووکی رەزاسووک بوون،وەکوو شمشاڵی رەشماڵی دۆڵی هەڵدڕی ولە بورجی خاپووری مێژووی ئەدەبدا ،کە بەراستی وەکوو ئاوێنەی جیهان نوما ،نیشاندەری تەواوی خۆشی وتاڵی رابردووی گەلەکەمانە ،پەچەی قورسی نیسیانی لە سەر ئەدەبدۆستان لادا ، شنەی نەرمە لاوێنی دەم بای خستە ناوکۆڕی ئەدیبان وئەدەبدۆستان و لەشی نەحەساوەی رێبوارانی لە رێگای دوور و پڕسەخڵەتی بێ پسانەوە وگەڕانەوەی ئەدەبی کوردەواریدا حەساندەوە .

ئەو ئەستێرە گەشە ، شۆڕە سواری مەیدانی ئەدەبی کورد کاک سوارەی ئێلخانی زادەکوڕی ئەحمەدئاغا ،کوڕی حاجی بایز ئاغای کوڕی حاجی ئێلخانی یە کە لە ساڵی ١٣١٦ی هەتاویدا لە گوندی "تورجان" ی سەر بە ناوچەی بۆکان هاتە سەر دنیا .

کاک سوارە خوێندنی سەرەتایی لە بۆکان دەست پێ کرد ،لە کاتی مێرمنداڵیدا

زۆر بزۆز و وریابوو ،بەڵام بەداخەوە لە تەمەنی ١٣- ١٤ ساڵیدا چەرخی چەوت وچەپگەردی رۆژگار لە گەڵی هاتە کایەوە و هەوەڵین نەیاری خۆی لە ئاستی دەربڕی نەخۆشی شەپلە (فەلەج) پای پڕهێزی کە لە کاتی راو لە چروچیاکانی ولاتەکەیدا ، یارمەتی دەرێکی باشی بوو ، لە هێزوتەوژم کەوت. ماوەی دووساڵ لەژێر چاودێری دوکتۆرێکی ئەڵمانی لە دەرمانگای بۆکاندا بوو.

شەوق و عەلاقەی بە زانست وفێربوون بە رادەیەک بوو، کە لەو ماوەیەدا لە قەرەگوێز لە لای مامۆستا مەلا محەممەد ئەمینی ئەشعەری کوری حاجی مەلا دەرسی دەخوێند .دوایەش گەڕاوە شاری بۆکان ولە قوتابخانەی ناوەندی (دبیرستان) وەکوو قوتابی یەکی (مستمع آزاد) وەرگیرا و تا پۆلی پێنجەمی ناوەندی لەوێ خوێندی.چونکوو لەو کاتەدا لە بۆکان کە شارەدێیەک بوو رێگای خوێندنی زیاتر نەبوو، بە ناچار لە باوەشی گەرمی خا و خێزان دوور کەوتەوە وئاوارە و پەریوەی تاران بوو. شاری بەگرمە ودووکەڵ و پڕ لە هاژە و هاڕەی ژیانی ماشێنی و خەڵکی بێ بەش لە نەشە وشنە.

کاک سوارە کە لە بەرتاوی گەرمی بەر دەواری عەشیرەت گۆچ کرابوو، و تەنیا بەجامی ئاوی کانیاوی دێیەکەی کوڵی دڵی پڕزۆخی دادەمرکاو بۆن و بەرامەی سەرسەکۆی کاگڵی ئاوپژاوی نیشتمانی جوانی پێ لە بێنداترین عەترەکانی هەندەران خۆشتر بوو ،بەهەر کووچە و شەقامێکی تاراندا کەبەشەلەشەل رادەبرد شەپۆلی خەم و خەفەت بەرەو دڵی دەهات. هەموو ئەو تایبەتمەندی یە جۆراوجۆرانەی ژیان وەکوو پەردەی سینەما لە لاپەڕەی خەیاڵیدا نەخشیان دەبەست وپلەی بەرزیان دەدا بە ئاسەواری بێ خەوش و گەردی ورەنگی سووڕ و شینیان دەدا بە شیعر و عاتیفەی گەشی .شوێنی ئەم کارتێ کردنەش لە شیعرە بەرزەکانیدا بەتایبەتی لە :**"شار"** **"خەوەبەردینە" و"کچی بەیان" دا** بەراشکاوی بەرچاو دەکەوێ.

کاک سوارە لە بەر دەستکورتی ونەبوونی بابی لە تاران دەچێتە ماڵی حاجی رەحمان ئاغای مامی وخوێندنی نێوەندی و زانستگا لەریشتەی (حقوق قضایی)دا درێژە دەدا. هەمیشەش ژیانێکی ساکاری بووە و بەدەست ئێشی لاقیەوە ناڵاندوویە.

سوارەی لەش بە بار لە بزووتنەوەسیاسی یەکانی خوێند- کارانی زانستگادا بەشداری دەکردو هەربەو بۆنەوە لەلایەن رێژیمی شایەتی ئەوسەردەمەوە گیرا و بۆ ماوەی دووساڵ لە زیندانی قزلقەلا زیندانی کرا .بەوحاڵەشەوە زۆریان جەزرەبە وئازاردا بەڵام بە شاهیدی هاوالانی زیندانی خۆڕاگری یەکی زۆری لە خۆ نیشان داو ورەی بە زیندانی- یەکانی دیکەش دەدا .

دوای ئەوەش کە دووساڵ لە تاریکە تاراوگەکەدا زەمانی تەریکی تێپەڕاند ، بە هیوا بوو بگرمێنێ هەوری بەهاری وگشت بەندی یەکان لەزیندانی بەردینی خارا رەها بن ، داخەکەم بە چاوی خۆی نەیدی کە چۆن هەوری رەشپۆشی بە گرمە ونالە نیازی هەزاران گەزیزەی بە نازی وەدی هێنا وئاوپڕژێنی کوڵی دڵی پڕزۆخی رۆڵە کوژراوانی گرتە ئەستۆی خۆی .

پاش بەسەر چوونی دەورەی تەریکی درێژەی بە خوێندنی خۆیدا و لیسانسی حقووقی قەزایی وەرگرت . با وەکوو دەیتوانی دەفتەری وەکالەت دابنێ کە کارێکی پڕ داهات بوو ، یا خۆ لە دادگوستەری دابمەزرێ ،بەڵام لە بەرئەوەی هەستی بەوە دەکرد کە لە هیچ یەک لەوکارانەدا ناتوانێ دەردێکی گەلە چەوساوەکەی دەرمان بکا ولە لای ترەوە شەوقێکی زۆری لە سەر شیعر و ئەدەب و فۆلکلۆری نەتەوایەتی گەلەکەی بوو ،

هەر کە پێشنیاری دامەزران لە دەزگای رادیۆی پێ کرا قەبووڵی کرد و سەرەڕای ئەوەی نیوەرۆکی بەرنامە رادیۆیی یەکانی بە دڵ نەبوو، لە بەشی شیعر وئەدەبدا دەستی بەکار کرد. کاک سوارە بەرنامەیەکی رادیۆیی بە ناوی "تاپۆو بوومەلێڵ" دەنووسی وهەر خۆشی بەڕێوەی دەبرد.لەو بەرنامەدا وەڵامی شاعیران و نووسەرانی لاو و تازەکار و نەناسراوی کوردی دەداوە.بۆ باشترکردنی بەرهەمەکانیان رێنوێنی دەکردن. جگە لە مانەش ئەدەب و فۆلکلۆری کوردی لەو بەرنامەدا شی دەکردەوە ولە سەریان دەدوا. شاعیر و نووسەرەکوردەکانی ئەو سەردەمە چ لە ئێران و چ لە دەرەوەی وڵات کەلکێکی زۆریان لێ وەردەگرت. دەنگێکی زۆر گیرای بوو،زۆر بەجوانی و رێک و پێکی شیعرەکانی دەخوێندەوە وبەرنامەکانی بەڕێوە دەبرد، هەربۆیەش سەرنجی گوێ گرانی بەرنامەکەی بۆ لای خۆی رادەکێشا.

کاک سوارە هەر لە تافی لاوێتی یەوە، لەو کاتەوەکە لە قوتابخانەی ناوەندی دەرسی دەخوێند، شیعری دەگوت، ئەو کاتەش کە خوێندکاری زانستگا بوو،هەر وەها سەردەمێک کە لەزیندانی تاغووتدا بوو و دوای ئازاد بوونی لە زیندانیش شیعری داناوە، کە شیعرەکانی دوایی بە هۆی بەرەو ژوور چوونی پلەی زانست وئەزموونی کۆمەڵایەتی لەباری نیوەرۆکەوە هەتا دەهات قووڵتر و پڕ ماناتر دەبوو و نیشاندەری هەستکردنی شاعیر بە دەرد و ژان و ئازاری کۆمەڵ بوون.

لە هونەری شاعیریدا رێبازی گۆرانی گرتۆتە پێش. شیعری خەییامیشی وەرگێڕاوەتە سەر کوردی.

کاک سوارەکە زوربەی تەمەنی کورتی ٣٨ ساڵەی خۆی بۆ خزمەت بە زمان وئەدەبی کوردی تەرخان کردبوو، لەساڵی ١٣٥٤ ی‌هەتاویدا لە نەخۆشخانەی میساقیەی تاران بە نەخۆشی سەرەتان مرد و داخ و کەسەرێکی زۆری بۆ ئەدەب دۆستان و هونەرپەروەرانی کورد بەجێ هێشت.

تەرمی پیرۆزی لە ناوچەی بۆکان بەخاک سپێردا،سەدبریا مابا و سروەی بەهاری ئازادی گەلەکەمانی بەچاوی خۆی دیبا.

جگە لە کۆمەڵە شریتی بەرنامەی "تاپۆو بوومەلێڵ" ئەم ئەسەرانەیشی لێ بە جێ ماوە:

١ـ خەوە بەردینە

٢ـ قەل و هەڵۆ: وەرگێڕاوی "عقاب" کە شیعری "پوشکین" ە و دوکتۆر پەرویزی ناتیل خانلەری کردوویە بە فارسی.

٣ـ بانگەوازی پەنجەرە

٤ـ تۆ دەریامی

٥ـ کچی بەیان

٦ـ شار

٧ـ دیمەنی بەفروزستان

٨ـ مردووـ وەرگێڕاوی شیعری پیترۆس دوریان شاعیری هەرمەنی لە فارسی یەوە بۆ کوردی

٩ـ هەوارە

١٠ـ خێڵی درو

١١ـ چەند پەخشانی وەک: داستانی چەکوش وەشێنی رۆڵە کوژراو ٢٠٠ لاپەڕە

ـ داستانی لاس و خەزاڵ ٢٠٠ لاپەڕە

ـ داستانی ئافرەت ١٠٠ لاپەڕە

ـ لێکۆڵینەوە لە سەربەیتی برایمۆک و سەیدەوان کە

هیوا دارم هەموئەوئاسەوارانە کۆبکرێنەوە و لە چاپ بدرێن، کە خزمەتێکی زۆر بەرزە بە ئەدەبیات و کەلەپووری نەتەوەکەمان .

# «شار»

گوڵم !
دڵم پڕە لە دەرد وکوڵ ،
ئەڵێم بڕۆم لە شارەکەت .
ئەڵێم بە جامی ئاوی کانیاوی دێیەکەم ،
عیلاجی کەم کوڵیدڵی پڕم، لە دەردی ئینتیزارە کەت .
وەڕەز بوو گیانی من،لە شاروهاڕە هاڕی ئەو ،
لە ڕۆژی چڵکنی نەخۆش و تاو ویاوی شەو ،
ئەڵێم بڕۆم لە شارەکەت ،
لەشاری چاو لەبەر چرای نیگۆن شەوارەکەت ،
بڕۆمە دێ ،کە مانگە شەو بزێتە ناو بزەم ،
چلۆن بژیم لە شارەکەت ،
کە پڕبە دڵ دژی گزەم ؟
لەشارەکەت ،...
مەلی ئەوین غەوارەیە .
ئەڵێی لە دەوری دەست و پێم ،
ئەوەی کە تێل و تان و رایەڵە ،
کەلەپچەیە ،
لە شارەکەت کەمەندی دووکەڵە
کە دێتە دەر لەماڵی دەوڵەمەند ،
وە تیشکی بێ گوناهی خۆرەتاو ئەخاتەبەند .
لەهەر شەقام و کووچەیەک شەپۆڕی شینە دێ بەرەو دڵم ،
دەستی گەرمی ئاشنا نیە کە ئەیگوشم ،
دەستی چێویە .
لە شارەکەت زەلیلە شێر ، گوڵم
باوی ڕێویە ،
بە هەر نیکایەک و پەتایەکا
ئەڵێم بڕۆم لە شارەکەت ، گوڵم
ئەڵێم بروم لە شارەکەت ،
گوڵم ،هەرێمی زۆنگ و زەل
چلۆن ئەبێتە جارە گوڵ
لە شاری تۆ ، لە بانی عەرشە قۆندەرەی دراو
شارەکەت ـ
ئاسکە جوانەکەم !
تەسکە بۆ ئەوین و بۆ خەفەت هەراو .
کێ لە شاری قاتڵی هەژار ،
گوێ ئەداتە ئایەتی پەڕاوی دڵ ؟
منێ کە گۆشی تاوی گەرمی بەر دەوارەکەی عەشیرەتم ،
بەدارە تەرمی کووچە تەنگەکانی شارەکەت ،
رانەهاتووە لەشم .
بناری پڕ بەهاری دێ
رەنگی سوور و شین ئەدا
لەشیعر و عاتیفەی گەشم
ئەڵێم بڕۆم لە شارەکەت گوڵم ،
ئەڵێم
بڕۆم
لەشارەکەت

بەداخەوە تائێستاش جگە لە فەرهەنگی خاڵ فەرهەنگێکی کوردی بە کوردی دیکەمان لە دەستدا نیە ، بەڵام ئەو فەرهەنگەش بێ کەم و کووڕی نیە ، ئێمە لەگەڵ ڕێز و سپاس بۆ مامۆستا شێخ محەممەدی خاڵ ئەوە ڕەخنەی کاک تاهای فەیزی زادەمان چاپ کردو چاوەڕێی لێکۆڵینەوەی پتری زانایانی کوردین ، بۆ ئەوەی لە دواڕۆژدا ئەو کەسانەی کە زۆر بە تاسەی نووسینی فەرهەنگێکی تەواوی کوردی بە کوردی بەوەن کەلکی لێ وەربگرن ، کەسانێکیش کە ڕەخنەی بەجێیان لەسەر ئەم وتارە هەبێ بۆ خزمەت بە وشەی کوردی بە سپاسەوە بۆیان چاپ دەکەین .

تاها فەیزی زادە :

# ڕەخنە لەسەر فەرهەنگی خاڵ

فەرهەنگی خاڵ تاقە قامووسێکی کوردی بە کوردی تەواوە کە تا ئێستا چاپ و بڵاو کراوەتەوە. ئەڵبەت لە لایەن زانایانی دیکەوە بە شێوەی زانستی بۆ نووسینی قامووسی زمانی کوردی هەوڵ دراوە کە بەداخەوە ئەم ئەرکە گرینگەیان بۆ تەواو نەکراوە.

گرینگترینی ئەم هەوڵدانانە لە لایەن مامۆستای بێ سەروشوێن ع.ئ.زەبیحیەوە دراوە کە جگە لە دوو بەرگی "ئ" و "ب ـ بەینەت"ی چاپ و بڵاو نەکراوەتەوە. کەوابێ ، فەرهەنگی خاڵ تا ئێستاش هەر تاقانەیە.

بەڵام بەداخەوە تاقانەیەکی ساوای بێهێزی پڕ کەم و کووڕی یە. هەرکات ویستبێتم پەنای بۆ بەرم یارمەتی نەداوم و گرێ پووچکەیەکی بۆ یەکالا نەکردووم. لە مانا لێکدانەوەی وشەکانی دڵم ئاوی نەخواردۆتەوە و شیکردنەوەی زاراوەکانی بە دڵمەوە نەنووساوە، کەوابوو پشتم پێی نەبەستووە، ڕەنگ بێ زۆر کەسی دیکەش وەک من وابن.

مەبەستم لە نووسینی ئەم وتارە ئەوەیە کە ئەو زانا و بەتایبەتی لاوە تامەزرۆیانەی کەدەزانم خەریکی دانانی قامووسی کوردین تووشی ئەم هەڵانە نەبنەوە و قامووسێکی ڕێک و پێک و زانستی پێشکێش بە نەتەوەکەمان بکەن. جا ئەوە لێرەدا بەکورتی بەڵام بە وردی لەسەر کەم وکووڕی‌یەکانی "فەرهەنگی خاڵ" دەڕۆم و دەدوێم ، بەو هیوایەی کە جێگای سەرنج و کەلک وەرگرتن بێ :

١ـ ئەو وشانەی کە فەرهەنگی خاڵ "گرتوونی" دەکرێ بە دوو بەشیان دابەش بکەین :

**یەکەم:** ئەو وشانەی کە کوردین و ناچنەوە سەر زمانەکانی تر، ئەو وشانە زوربەی وشەکانی فەرهەنگی خاڵیان پێک هێناوە، دەبا مامۆستا شێخ محەممەدی خاڵ لەکاری خۆیدا بۆ هەر وشەیەک کە بەرانبەر "معادل"ی لە زمانەکانی ئاوێستایی و پەهلەویدا ماوەتەوە، ریشە ئەسڵی‌یەکانی دەست نیشان بکا و بەدوای ئەوەشدا چۆنیەتی خوێندنەوە "تلفظ" یانی نووسیبا ، یا هەرنەبێ بەرانبەرەکانی ئاوێستایی و پەهلەوییەکانی بێنێ ، بۆ وێنە لەو هەموو وشە ڕەسەنە کوردیانە تەنیا وشەیەک دەنووسم کە ببێتە

هەوێن بۆ وشەکانی دیکە :

بۆ "**ئاشتی**" لە فەرهەنگی خاڵ ، جزمی یەکەم، چاپی یەکەم ،لاپەڕەی ٥٠"دا هەر ئەوەندە نووسراوە :

( ئاشتی) ڕێکیودۆستایەتی.

دەبا نووسرابا :

**(ئاشتی)**= ( ئاویستاییەکەی ئاخشتی ، پەهلەوییەکەی : ئاشتیە ).

جا ئەودەم ماناکەی نووسرابا ، کە ئەویش تەواو نیە .

**دووەم:** وشەکانی لاوەکی : کە کوردی نین و ماکی زمانی تریان هەیە و تێکەڵ بە زمانی کوردی بوون، زوربەی ئەو وشانە فارسی،عەرەبی ، تورکی ، ئینگلیسی یا فەڕانسەوین،ئەو وشانە لە زمانی کوردیدا بەپێی داب و دەستووری زمانەکەمان سواون، هەڵشێلدراون و تەحریف کراون و بەکورتی گۆڕاون، دەبا مامۆستا خاڵ بە دوای ئەو وشە خواستراوانەدا ئیملای وشەکان بهێنێ و دوایەش چۆنیەتی خوێندنەوە ـ یان بنووسێ و بفەرمێ لە کام زمان ڕا وەرگیراون و لەباری دەستووریەوەچن، (ناو ،سیفەتە "ئاوەڵناو" ،قەید"ئاوەڵ کار" فیعل " کار" یا ..."ن.

ئەوا هێندێک لە وشە **فارسی، عەرەبی،تورکی ، ئینگلیسی، و فەڕانسەوییەکا ـ** نی نێو فەرهەنگی خاڵ دەخەمە بەرچاو و لە هەرکامیان تەنیا وشەیەک هەڵدەبژێرم و چۆنیەتی نووسینی لە قاموسی زمانی کوردیدا ڕادەگەیەنم.

" هێندێک لە وشە **فارسی ـ** یەکان : " ئاموشۆ ، ئاسوودە ئاشووب ، باوەجۆ ، بافت ،باز بەردار ، بەرپا ،بێدار ،برادەر جا ، چابوک ، وەشەی " چابوک، هەڵدەبژێرین کە دەبوو پێش لەوەی ماناکەی لێ بدرێتەوە ئەم روون کردنەوەی لەسەر بنووسرێ :

**( چابوک )**= ( فارسی " چابک " ، ئاوەڵناو )

هێندێک لە وشە **عەرەبی ـ** یەکان : " عال ، ئالف ، عار ئارەق ، ئاخر ، عازەبە ئازیز بەلا، بەنا ، بەقال" وشەیەکی هەڵبژاردە : ( ئارەق)، کە ئەم روون کردنەوەی دەویست :

**( ئارەق)** = ( عەرەبی " عرق " ، ناو )

هێندێک لە وشە **تورکی ـ** یەکان : " ئاغزە، چەتە ، چەخماخ، دەمار، قاچاخ ، وشەیەکی هەڵبژاردە : (قاچاخ )

**(قاچاخ)**= ( تورکی ( وەرگیراو لە مەسدەر " چاوگ "ی قاچماخ یا قاچمق ، ناو )

هێندێک لە وشە**ئینگلیسی ـ** یەکان : بومبا bomb ، جانفاس = canvas ، چاکەت= jacket ، چیمەنتۆ = cement ، چینکۆ = zinc ، دۆمینە = dominoes ، گالۆش = galoshes ، ئاوەنووس = ( عەبەنووس ebony

وشەیەکی هەڵبژاردە : (بۆمبا )

**(بۆمبا )**= ( ئینگلیسی ولە ئەسڵدا فەڕانسەویە bomb) چۆنیەتی خوێندنەوەی بۆمب یا بامب ، ناو ).

هێندێک لە وشە **فەڕانسەوی** ـ یەکان : " بالۆن= le ballon چەک le chéque "

وشەیەکی هەڵبژاردە: (چەک)

**(چەک )**= ( فەڕانسەوی = le chéque ، چێک ، ناو )

**٢ ـ** مامۆستا لە سەرەتای فەرهەنگەکەیدا جزمی یەکەم، چاپی یەکەم،١٣٧٩ ی مانگی ، لاپەری ٣٨) ، بەڵێنی داوە کە وشە و زاراوەی شێوە ( لەهجە )ی بادینانی ، زازا ، ئەردەلانی و موکری و چەند بن لەهجەی تریش لە فەرهەنگ ( قاموس)ی خۆی بخا و بۆ ئەوەی دەبێ ناوی فەرهەنگەکەی ببێ بە " فەرهەنگی زمانی کوردی" بەلام لەوانە کەمی کەلک وەرگرتووە و زوربەی وشە و زاراوەکان هەر دەچنەوە سەر لەهجەی شاری سولێمانی کە زێدی خۆیەتی، تازە گومان لەوەش دەکرێ کە هەموو وشەکانی ئەو لەهجەی گرتبێ.

**٣ ـ** دەبا مامۆستا خاڵ پاش لێکدانەوەی مانای وشە و زاراوەکان چەند نموونەیە کیشی لە رستە و شیعر و

مەتەڵ و گۆرانی وبەیت و چیرۆک و...وەک شایەد (شاهید) بۆ هێنا باوە ، ئەم چەشنە نموونە و شایەدانە دەبنە هۆی زیاتر روون بوونەوەی مانای وشەکان، بۆ نموونە وشەی ( قەت ) لەو فەرهەنگە دەخەینە بەرچاو ، کە دەبوو بەم جۆرە مانای لێ بدرێتەوە

**(قەت )** = ( عەرەبی ( قط قەیدی زەمان ) واتە هەرگیز ، دژەکەی دەبێتە هەمیشە ، تەئکیدەکەی قەت‌قەت ، لە رستەی مەنفی و پرسیاریدا بەکار دەبرێ ، لە لەهجەی شیمالدا کورتتر کراوەتەوە بۆتە قە، نموونە: قەتت دیوە وشتر بۆ گێرە ببەن ؟ قەت نابێ روو لە کاری چاک وەرگێڕین .

**قەت وادەبێ خاکی دەری تۆ**
**تاجی سەرم بێ**
**ئەو دەوڵەتە بۆ من نیە، ئەی**
**خاک بەسەری من**

" وەفایی"

**لەو دەمەی مەستی سوراحی**
**چاوی دڵدارە ئەدەب**
**قەت نەکەن باوەڕ بڵێن یەک**
**لەحظە وشیارە ئەدەب**

( ئەدەب )

**تا دەس لە مل هیوانەکەم**
**شەرطە نەنیشم قەت بەتاڵ**

( سروودی نوێ بو قوتابیان)

زێوەر،ل ١١

ئەڵبەت جگە لەمانەش دەتوانین نموونەی زۆری دیکە بێنینەوە ،لێرەدا تەنیا لەنێو ئەو شیعرانەدا کەپێش لە ساڵی ١٩٦٠ـ ساڵی لە چاپ دەرچوونی جزمی یەکەمی فەرهەنگی خاڵ ـ چەند شیعرێکم هەڵبژاردووە .

٤ ـ دەبا مامۆستا خاڵ بەشە پێکهێنەرەکانی وشەی لێکدراو ( کلمات مرکب ) بە نیشانەی( + ) لێک جوێ بکاتەوە .ئەو کارە کارێکی زۆر باشە بۆ زووتر و پتر تێگەیشتنی مانای وشەکان. لێرەدا بۆ وێنە مەسدەر ( چاوگ )ێک و ناوێکی لێکدراو (مرکب ) لە"فەرهەنگی خاڵ " هەڵدەبژێرین و بەو شێوەی کە لە سەرەوە باسمان کرد ،لێکیان دەکەینەوە ، تا بزانین چەندە زوو ماناکەیان دەقۆزینەوە و چۆن بە بەربلاوی تێیان دەگەین :

**(زەنگاڵ)**=ناوی لێکدراو ( مرکب ) = زەنگ + ئاڵ ) زەنگ لە زمانی پەهلەویدا بەمانای " پووز و بەلەک "ە و ئێستاش لە کوردیدا ماوەتەوە ( بڕواننە فەرهەنگی پەهلەوی.ل ٩٥و٩٠ دوکتۆر فەرەوەشی ) ، ئاڵ پاشبەندی تەشبیە ( وێکچوون) و نیسبەت ( چوونەوەپاڵ)ە ،( بڕواننە قامووسی زمانی کوردی ع. ئ . زەبیحی) ، ماناکەی : شتێک کە دەچێتە سەر بەلەک و تێی دەهاڵێ یا کورتتر: شتێک کە بە بەلەک وەردەپێچرێ، بەلەک پێچ .

**( تێک بەربوون)**= ( چاوگی تێکەڵ = تێک + بەر+ بوون = تێ + ئک + بەر+ بوون = دە + یەک + بەر + بوون) حاڵی چەند کەس ( یا چەند گیان لەبەر) کە بە گژی یەکتردا بچن .

٥ ـ مامۆستا خاڵ دەبا بەدوای هەر مەسدەر ( چاوگ)ێکدا نووسیبای کە تێپەڕ ( متعدی)ە یا تێنەپەڕ (لازم).

ئەم کارە پێویستە لەبەر ئەوە کە کار ( فعل)ەکان سەرچاوەکەیان مەسدەر (چاوگ) ـ ە و ئەوانیش بە گوێرەی تێپەڕی و تێنەپەڕی مەسدەرەـ کەیان هەروایان بەسەر دێ. دەزانین کە تێپەڕ ،کار (فعل ) ـ ێکە جگە لە فاعیل پێداویستی بە مەفعوولیش هەیە، بەڵام بە پێچەوانە تێنەپەڕ کارێکە هەر پێداویستی بە فاعیل هەیە ، بۆ وێنە چاوگێک لەهەر کامیان لە فەرهەنگەکەدا هەڵدەبژێرین و چۆنیەتی نووسینیان لە قامووسدا بەرچاو دەخەین :

**" خواردن"** =( چاوگ ، سادە ، تێپەڕ) .

**" ڕۆیشتن"**= ( چاوگ ، سادە ، تێنەپەڕ)

زۆر وشەی لاوەکی هەن کەلە زمانی کوردیدا لێک و لووس و تەحریف کراون ، مامۆستا خاڵ ئەوانەی لەگەڵ وشەی رەسەن و خۆماڵی هاو(شکڵ) هەر بە

یەک ماک هێناون و لەجێی
مانای حەقیقی دایمەزراندوون
کە نابێ وا دامەزرێن.

٦ - وشەی واهەیە چەند
مانادەدا. مانایەکیان کە
پڕبەپێستی وشەکەیە، مانای
حەقیقی یە وئەوانەی کە
لێی دوورترن **مانای مەجازی**
وشەکەن، دیارە مانادوورەکان
بە گوێرەی رادەی دووری و
نزیکی ڕێک وریز دەکرێن.
**مانای حەقیقی** ژمارەی یەکی
دەدرێتێ وبەدوای ئەودا
ژمارەی ٢،٣... بۆ مانا
مەجازی یەکان دادەنرێ.
ئەم ئەسڵەی نەزمی نوێی
قامووس نووسی لە "فەرهەنگی
خاڵ" دا رەچاونەکراوە.

بۆوێنە بۆ وشەی **بۆن
کردن** کە "فەرهەنگی خاڵ"
نەیشیگرتووە دەبووبنووسرێ:
**(بۆن کردن)=** چاوگی
تێکەڵ = بۆن + کردن.

١- هەست کردن بە بۆن-
کەپۆی گیراوەوبۆن ناکا ٢-
پەیدابوونی بۆنی ناخۆش لە
هێندێک شت کەزۆر بمێنێتەوە.
ئەو ئاوە هێندە ماوەتەوە
بۆنی کردووە. ٣-(مجازی) تۆزێک
ئاگاداربوون لە کارێکی
نهێنی - کابرا هێندە بەم
دەورروبەرانەدا دێ و دەڕوا،
دەڵێی بۆنی شتێکی کردووە.
٤- وەبەر لووتدانی شتێک
بۆ ئەوەی بزاندرێ بۆنی لێ
دێ یا نا؟ بۆن پێوەکردن
(بەکەلک وەرگرتن لەقامووسی
زەبیحی )

٧- لە نەزمی نوێی
قامووس نووسی دا ئەو وشانەی
کە لە نووسیندا وەک یەکن
بەڵام هەریەکە مانایەکیان
هەیە (کلمات متشابە = )
بە دوای یەکدا دەنووسرێن و
ژمارەی ١،٢... یان لە
پێشەوە بۆدادەنرێ. بۆ وێنە
وشەی "دان" هەڵدەبژێرین
و شێوەی نووسینەکەی دەست
نیشان دەکەین:

١- (دان)=(ناو، ناوی سادە)
واتە ددان

٢- (دان)=(ناو، ناوی
سادە) واتە دانەوێڵەیەک
کە دەردێ بە باڵندە.

٣- (دان)=(چاوگ، چاوگی
تێپەڕ) واتە بەخشینی شتێک
بە کەسێکی تر.

٤- (دان)=(پاشگری مەکان)
وەک گوڵ+ دان = گوڵدان.

٥- (دان)= بەمانای وەخت
وزەمان - دانی پێش نیوەڕۆ
یانی لە کاتی پێش نیوەڕۆدا.

٨- مامۆستا خاڵ بۆ هەر
وشەیەکی دیاری کراو، لە
فەرهەنگەکەیدا وشەی دژمانا
( متقابل یا متضاد) کەشی
هێناباوە، بەم کارە ڕێگای
زووتر و پتر تێگەیشتن، بۆ
خەڵک خۆشتر دەکرد. وەک
وشەکانی.

**سەرما ≠ گەرما**
**لەبار ≠ نالەبار**
**جوان ≠ دزێو**

( بڕوانە: ج٢ و٣ فخ)

٩- مامۆستاخاڵ دەبا بە
دوای نووسینی هەرچاوگێکدا
ریشەی کار ( ریشەی فعل)یشی
نووسیبا نووسینی ریشەی کار
لە قامووس نووسی ئەورۆدا
کارێکی پێویستە وێرو گرفتێکی
زۆرمان بۆ وەلادەبا.
ئەوا وێنەیەک لەفەرهەنگە
- کە بەرچاو دەخەین و
چۆنیەتی پڕ کردنەوەی ئەو
کەلێنە رادەگەیەنین.

( کوتان) =( چاوگی تێپەڕ،
ریشەی کار: کوت ).
(بزمار+ کوت )= **بزمارکوت**
کوت + راو = **کوتراو**
کوت + ئەک = **کوتەک**
کوت + و + پڕ= **کوت و پڕ**

دواقسەم ئەوەیە: کە
قامووس نووسی ئەوڕۆ بۆتە
زانست و وەک زانستەکانی
دیکە بەرەوپێش دەڕوا، پتەوتر
و بەربلاوتر دەبێ. بێخەوش و
غەورترین و لەبارترین
قامووسی ئەوڕۆ، بەپێی داب و
دەستووری قامووس نووسی
دواڕۆژ، پێداویستی بە
پێداچوونەوە، بژارکردن و
وەسەرخستن هەیە، کەوابوو
نەک هەرئەم فەرهەنگەبەڵکوو
فەرهەنگی فارسی" معین"یش
بەپێی ئەم نەزمە زانستییەی
ئەوڕۆ، کەم وکووڕی تێدایە
بۆوێنە، بەرامبەرە لاوەکییە
-کان ( معادل خارجی) و
ریشەی کاری تێدانیە، بۆخۆشی
هەستی بەم کەمییە کردووە و

. تازە گەیشتبوومە ئیدارە جگەرەیەکم داگیرساندبوو و مژ لە سەر مژم لێ ئەدا، دەرگای دیوەکە کرایەوە پیرە پیاوێکی کۆم بووەی کورتە بالا وەژوور کەوت و ڕاستەوخۆ بەرە و میزەکەم هات و بێ سێ و دوو گوتی:

— ئەرێ قوروان دەرمان بۆ ولاغ و چتی والەگرا ئەنووسن؟

سەلام و بەخێرهاتنم کرد. لە سەر کورسییەک دانیشت. بێ ئەوەی چاوەڕوانی وڵامی پرسیارەکەی بێ خێرا دار جگەرەیەکی درێژی لە بەر پشتێندەکەی دەرهێنا و بە لێوە چرچەکانیەوە گرت، جگەرەیەکی قەڵەوی دەست پێچی داگیرساندو مژێکی توندی لێدا و، دووکەڵەکەی بە کونە لووتیدا هاتە دەر باشکە سەرنجم دایە وەبیرم هاتەوە، جارێکیان لە دێیەکی ئەو دەورو بەرانە دیتبووم و بەسەرهاتەکەیان بۆ گێڕابوومەوە.

— بەڵێ مامە، لێرە دەرمان ئەدەن بۆ چیت دەویست؟

— وەڵا قوروان مانگایەکی زەردمان هەس، نۆ ڕۆژ ڕەبەقە نەخۆشە و قرتەی نەکردییە.

— باشە مامەگیان چیەتی؟

بەواق وڕ مانێکەوە سەیری کردم، سەری ڕاوەشاند و گوتی:

— بەخوا سەیرە جائەگەر بمزانیایێ چیەسی لای جەنابتان بۆ ئەهاتم قوروان؟

گوتم:

— مامەگیان زوێر مەبە مەبەستم لەو پرسیارەئەوەیە چۆنیەتی حاڵی بزانم، بزانم ئایا ئەلەوەڕێ کاوێژ ئەکا؟

— قوروان پێم واسە تێ نەگەیشتبی، بڕوابکە خۆم نەئەفیرێنم و نەبیلاتەشبیە بۆنێشی گوڕیاوە. بۆ مانگام زەرد هاتیم، مانگا زەرد.

وریا گوتی:

— تێ ئەگەم مامەگیان ئەوەی

ئەفیرێنێ؟ بۆنی شیاکەکەی دێ یا ...؟

قسەکەی پێ بڕیم بە ئالۆزییەکەوە گوتی:

— حەی — حەی جا تۆ خوا ئەمە قسەیە قوروان؟ بزا لەم ئاخر پیریەوە بۆنی شیاکەیشم پێ ناکەن و لە ناودێکەدا نامکەنەوە پەن؟

وریا مەودای قسەی پێنەدام لێوی کرۆشت و دەفتەرەکەی گردەوە و، ڕووی کردە کابرا و گوتی:

ناوت چیە؟

— قوروان مانگازەردی پێ ئێژین، ناوی مانگازەردە.

وریا بزەیەکی هاتێ و گوتی:

— کاکە گیان ناوی خۆت ئەڵێم، ناوی خۆت چیە؟

کابرا بە ئەسپایی لەسەر کورسیەکە هەستا و چووە پێشەوە ودەمی بردە پەنا گوێی وریا و گوتی:

بە هۆی ولاغ و ئاژەڵەوە دێتە ئەم ئیدارەیە پێویستە ناوی لەم دەفتەرەیا بنووسرێ ئێستا پێم بڵێ بزانم ناوت چیە؟

— ئائێستا تێ گەیشتم قوروان، پیرییەو گوێ گرانی. بنووسە، حەمەی نۆکەرت.

— ناوی فامیل؟

— بەڵێ؟!

— ناوی فامیلت ئەڵێم حەمەی چیتپێ ئەڵێن؟

— وەڵاهی بەم پرسیارانە مانگازەرد هیچ، ناوی خواشتان لەبیر بردمەوە.

حەمەی خولە قنجەم پێ ئێژن هەر بەناو باوکیشمەوە شۆرەتی قنجەیان بۆ دەر هاوردیین.

وریا دوای نووسینی فامیلەکەی قەڵەمەکەی لەسەر دەفتەرەکە دانا و ڕووی کردە کابرا و گوتی:

ـ گوێ بگرە مامەگیان ئێمە نە ئەتکەین بە پەن نە بەو پرسیارانەش ناوی خودات لە بیر ئەبەینەوە، تەنیا ئەمانەوێ جۆری نەخۆشینەکەیمان بۆدەر کەوێ بەستەزمانە و خۆی ناتوانێ بڵێ کوێم ئێشێ .

خالید کە تا ئەوکاتە بێ دەنگ بوو، چاویلکەکەی بزاوت و گوتی :

ـ بۆ خێرا فریای نەکەوتی و دوای تێپەڕ بوونی نۆ رۆژ بەسەر ناساغی مانگا کەتا کەوتوویتە بیر دەوا ودەرمان پێم وایە ئەگەر ناساغییەکەیشی شتێکی ئەوتۆ نەبووبێ ئەم دێر فریا کەوتنەت دەردەکەی لێ گرا نتر کردووە خۆت باشتر ئەزانی ،هەموو گیانەوەری ، وەکوو ئادەمیزاد هەست بە ئێش و ئازار ئەکا .

کەی خوا هەڵ ئەگرێ ئەو بێ زمانە نۆ رۆژ بەو دەردەوە بتلێتەوە ؟

کابرا ئەنگوستە ئەستوورە قەڵە شاوەگەی لە کونەلووتی دەرهێنا و بە پشتێنە چڵکنەکەی سڕی و گوتی :

ـ باس و خواسی قەبر نەما لێتان کردم ! راستیت ناوێ ئێمە و مانان ئەونەباوەڕمان بە دەواو دەرمان وشتی وانیە ئەوسا حاجی شێخ حسەین قەوری پڕ نوور بێ بەهرەی بوو. ولاغ و ئاژەڵ تەنانەت خۆشمان نەخۆش بکەوتایەین دەرمانە بخۆمانەی پێ ئەدایەن و نووشتەی بۆ ئەنووسین .

جا ئەگەر رەزای خوای لەسەر بوایە خاس ئەبووینەوە.

بروانە ل ٧٧

# ئێمە و خوێنەر

مەهاباد: کاک سیامەندی فتووحی

رەخنەکانت بە تایبەتی لە سەر هەڵەی چاپ لە "نالەی منداڵ"دا زۆر بە جێ بوون. داوای لێ بووردن لە ئێوە و لە هەموو خوێنەرانی سروە دەکەین. ویستیشمان بە چاپکردنی نووسراوەکەت پێت بسەلمێنین کە هەر نووسراوەیەک باش و بە نرخ بێ چاپ دەکرێ جا هەر کەس نووسیبێتی.

• بۆکان: کاک خوسرەوی میرموکری

بەشێک لە پێشنیارەکانت تائێستا جێ بە جێ کراوە. بەو هیوایەن ئەوانی دیکەش لە داهاتوویەکی نزیکدا جێ بە جێ بن.

براگیان نەک هەر پێمان ناخۆش نابێ، بەڵکوو زۆریشمان پێ خۆشە لاوەکانمان پێ بگەن و رەخنەمان لێ بگرن.

ئەمریکا: کاک بەختیار دەرگەلەیی

نامەکەت گەیشت. رەخنە و پێشنیارەکانت بە جێن. هیوادارین ئەوەندەی بۆمان بلوێ داخوازەکانت جێ بەجێ بکەین.

• گوندی شێخانی ناوچەی شنۆ: کاک حاسڵ قادری

یەکەم نامەتان بە دەستمان نەگەیشتووە. سپاست دەکەین کە ئامادەیی خۆت بۆ هاوکاری لە سەر باسی "کەڵبەش" دەربڕیوە. خوا یار بێ لە داهاتوودا لە نزیکەوە پەیوەندیت لە گەڵ دەگرین. بەداخەوە شیعرەکەی خوالێ خۆشبوو مەلا رەسووڵی ئەدیبیمان بۆساخ نەکراوە تا کەلکی لێ وەربگرین.

پیرانشار: کاک قادر پیرەمرد

زمانی یەکگرتووی ئەدەبی کوردی لەهجەی هیچ ناوچەیەکی تایبەتی نیە. ئی هەموو کوردە. بۆ ئاگاداری زیاتر سروەی ژمارە ۳ و ۴ بخوێنەوە. شیعری:

**لەو رۆژەوە رۆیشتووە تۆراوە دڵی من**
**هەرچەند دەگەڕێم بێ سەروشوێن ماوە دڵی من**

"هتد"

ئی "بێخود"ە و دەتوانی لە دیوانەکەیدا بیخوێنیەوە. تائێستا زۆر جاران بڵاو کراوەتەوە و بڵاوکردنەوەی لە سروەدا بە پێویست نازانین.

بۆکان: کاک خالیدی قەلعەکووهی

وێڕای سپاس لە نامە و هەستی دڵسۆزانەت، وێنە جوانەکانت و هەروەها لەوەی کە ئامادەیی خۆت بۆ هاوکاری زیاتر دەربڕیوە، لەم سووژانە دەتوانی وێنە بگری و بۆمانی بنێری: دیمەنی تەبیعی ناوچە، دوورەدیمەنی شار و گوندەکانی کوردستان شوێنەواری کۆن (آثار باستانی) و دیمەنی ژنان و پیاوانی بێ بەش و هەر سووژەیەک کە هەژاری و بێ دەرەتانی خەڵکی کوردستان نیشان بدا. وادیارە ئێوەش وێنەگرێکی بێ زەوق نین و لایەنی هونەریتان لە بەرچاوە.

پاوە: کاک باقی سەففاری

ئەوی بابەتی فۆلکلۆری کە دەیزانی و بیستووتە هەر بە شێوەی هەورامی و وەک لە زمانی خاوەنەکەیەوە بیستووتە بۆمانی بنێرە. ئەڵبەت ئەگەر لە گەڵ ئەوەشدا وەرگێڕاوەکەیمان بە کوردی ئەدەبی بۆ بنووسیتەوە پتر سپاست دەکەین. بەڵام شیعر و فۆلکلۆری هەر ناوچەیەک بە لەهجەی خۆی بڵاو دەکەینەوە.

**سەقز :کاک ڕەحمانی محەممەدزادە**

ئێوەش دەتوانن چیرۆکی فۆلکلۆری وشتی وامان بۆ بنێرن .بەداخەوە هەروەک خۆت نووسیوتە فەرهەنگێکی کوردی وامان نیە کە بتوانین پشتی پێ ببەستین .دیارە ئەرکی زانا کوردەکانە کە بۆ نەهێشتنی ئەم کەموکووڕی یە هەوڵ بدەن .چاوەڕوانیتان لەم ناوەندە فەرهەنگی یە بەجێ یە وئامادەیی ئێوە بۆ هاوکاری لەم زەمینەدا جێگای ڕێزە .ئێوەوخوێنەرانی دیکەی "سروە" دەتوانن بەکۆکردنەوەی وشەی ڕەسەنی کوردی بە ماناوەهەرچەند ناتەواویش بێ وناردنی نوسخەیەکی بۆ ئێمە ئەرکی خۆتان بە جێ بگەیەنن .بەڵکوو خودا تەوفیقمان بدا لەداهاتوودا هەنگاوی بۆهەڵێنینەوە .

گوندی هورمزاوێی سەردەشت :**کاک حەمزەی قادری**

وێڕای سپاس لە نامەو هەستی خاوێنت ،هیوادارین لەمەودوا سروە زووتر بگاتە سەردەشت .ڕەخنەوپێشنیارەکانیشت لە لایەن خوێنەرانی دیکەوە هاتبوونە گۆڕێ و بڵاو کراونەتەوە .خوایاربێ سروە لەو ڕێگایەدا کە گرتوویەتە پێش سەردەکەوێ. ئێوەش درێژە بە هاوکاری خۆتان بدەن .

سەقز :**کاک حامیدی ئەسعەدی**

سروە وەک گۆوارێکی ئەدەبی – فەرهەنگی لە خزمەتی زمان و فەرهەنگی گەلی موسڵمانی کورددایەو فەرهەنگی گەلی موسڵمانی کوردیش بەشێکە لە فەرهەنگی ئیسلام. زیندووکردنەوەی فەرهەنگی ڕەسەنی نەتەوەکەشمان خزمەتێکی گەورەیە بە ئیسلام و بە گەلی چەوساوە و بێبەشی کورد .چاوەڕوانیشمان لە هەموو دڵسۆزانی ئیسلام و کورد بە تایبەتی ماموستایانی ئاینی ئەوەیە بە ناردنی نووسراوەی بەکەلک کەم و کووڕی گۆوارەکەمان پڕ بکەنەوە .

گوندی سلۆکی مەهاباد :
**کاک برایمی عەزیز ئەرشەد**

خوا یار بێ داخوازەکەت لە سەر ناساندنی خانزادی سۆران و هەر وەها دزێوی و نالەباری ژن بە ژنە و ژن هەڵگرتن وبەرخوێن دان و... لە ژمارەکانی داهاتوودا دەخەینە بەر باس .

لێرەدا سەرنجی ئەو بەڕێزانەی کە دەیانەوێ شت بۆ سروە بنووسن ،بە تایبەتی ماموستایانی ئاینی بۆ ئەم مەبەستە گرینگە کۆمەڵایەتی یە ڕادەکێشین هیوادارین لەم بارەوە نووسراوی بەکەلکمان بۆ بنێرن تا بڵاوی بکەینەوە .

**نەغەدە :کاک جەببار خۆشناو**

نەک هەر گۆوار بەڵکوو گۆڤاریش وشەیەکی داتاشراوە کە لە "گوتن"ەوە دێ. بە بڕوای ئێمە وەک زۆر وشەی دیکە لە لەهجەی کوردی شیمالدا بە "ڤ= v" دەگوترێ و دەنووسرێ بەڵام لە لەهجەی کوردی نێوەڕاستدا بە"و= w" وەک "چاڤ، ئاڤ، هیڤی، شیرڤان و ..." کە لە کوردی نێوەڕاستدا دەبن بە "چاو، ئاو ،هیوا ،شیروان و ..."

پیرانشار :**کاک نامیقی کوهنە پووشی**

وێڕای سپاس نامەووێنەکانت گەیشتوون.شیعری نوێی کوردی بەو مانایە کە لە چوارچێوەی کێشی عەرووزیدا نەبێ ،لە پێش شیعری عەرووزیشدا لە بەیتە فۆلکلۆری یەکاندا بووە و لە ڕاستیدا شیعری نوێی کوردی گەڕانەوەیە بۆ سەر کێشی کۆن .

سەقز : **کاک هیوا ب**

پێشنیارەکانت بەگشتی جێگای سەرنجن .ئێمەش لەو بڕوایەدا ین کە نەک هەرشیعر ، بەڵکوو ئەدەبیات دەبێ وەڵامدەری هەزاران پرسیاری بەرەی نوێ بێ .ئەڵبەت مەبەستی خۆت زیاتر روون نەکردبۆوە ونموونەیەکیش لە شیعرەکانی خۆت نەناردبوو . داواتان لێ دەکەین پترمان هاوکاری بکەن .

بۆکان:کاک ئەحمەدی ئەمجەدی

ئێمە هەر شیعرێکی بایەخداری نوێ لەشاعیرانی لاومان بگاتە دەست بەنۆرەی خۆی لەچاپی دەدەین و لەو بارەوە کەمتەرخەمی ناکەین. چاوەڕوانی گەیشتنی پێشنیارەکانی دیکەی ئێوەین.

مەهاباد:کاک خالیدی مام عەزیز

ئێوە دەتوانن ژیاننامە و پلەی هونەری ئەو بەیت بێژەمان بۆ بنووسن.خوا یاربێ لە ژمارەکانی داهاتووی سروەدا بڵاوی دەکەینەوە.ئەڵبەت بەمەرجێک کە جوان و رێک و پێک نووسرابێ و دەستەی نووسەرانی سروە پەسندی بکا.

سەقز:کاک حامیدی شافیعی

زۆر سپاسی هەستی جوانت دەکەین.بە هیوایین چوارەمین ژمارەش جێگای رەزامەندی ئێوە و هەموو خوێنەرانی سروە بێ.

مەهاباد:کاک کەمالی فەتتاحی قازی

لە پێشنیارەکەت سەبارەت بە وەرگرتنی تەنز و چیرۆک و بەیت لە خاڵە سوورە پێشوازی دەکەین. جا ئەگەر لەسەر ناساندنی ئەو هونەرمەندەش شتێکمان بۆ بنووسی سپاست دەکەین.

نەغەدە:کاکە لاوپشدەری

شیعر و نامەزۆرجوانەکەت گەیشت. هەر لە ئێستاوە جێگای خۆت لەم گۆوارەدا کردۆتەوە و داوای هاوکاری زیاترت لێ دەکەین.ئەمەش نموونەیەک لە شیعرەکەتکە هیوادارین لە داهاتوودا بتوانین هەمووی بڵاو بکەینەوە.

**نەمردم جارێکی دیکەش بەوردی**

**لە غوربەت خوێندمەوە گۆواری کوردی**

سنە:کاک عەلی خانی

پێشنیارەکانت بەنۆرەی خۆی بڵاو دەکرێنەوە.

مەهاباد:کاک چەمشەمزاو

لە باسی زمانی یەکگرتوودا ئێمە نەمانگوتووە نابێ لە وشەی زمانەکانی دیکە وەک: "کونگرە،مەسەلە زەمینە،ئیدیعاو..."کەڵک وەربگرین.بە پێچەوانە ئەو کارەمان لە جێگایەکدا کە وشەی رەسەنی کوردی مان نەبێ لە وشە داتاشین پێ باشترە.ئێمە دەڵێین رەستە و جوملەکانمان دەبێ کوردی بێ و جوملەی وەک:"زەنگی خوارد"،"بەمەسیرم ناخوا" و... کوردی نین،هەر چەند وشەکانیشی کوردی بێ.تکایە جارێکی تر ئەو باسە بخوێنەوە.پێشنیارە جوانەکانیشت لە بەر چاو دەگرین.

مەهاباد: خوشکە مەنیجەی لەیلی

وێڕای سپاسهیوادارین وەکوو خوشکێکی دڵسۆز درێژە بە هاوکاری خۆت لەگەڵ"سروە" بدەی.

مەهاباد:کاک ناسری ئەمیری

خوا یاربێ بەوەختی خۆی کەڵک لە نووسراوەکەت وەردەگرین.بەڵام لە سەر جوغرافیای مەهاباد دەبێ پترلەوە بنووسی و هەموو لایەنێکی جوغرافیای تەبیعی،ئابووری وئینسانی مەڵبەندەکە بخرێتە بەر باس.هیوادارین زیاتری کار لەسەر بکەی.

پیرانشار:کاک فەتاحی نەهری

وێڕای سپاس،ئێوەش دەتوانن بە ناردنی وێنەی جوان وبە مانا یارمەتی گۆوارەکەتان بدەن.لە نێو ئەو دیاریانەداجوانترینیان بۆچاپ هەڵدەبژێرین.دەتوانن بە جێگای وێنە فیلمەکەیمان بۆبنێرن.ئەڵبەتئەگەر هەر دووکیان بنێرن باشترە.

بۆکان:کاک محەممەدی ئەبکان

ئێوە بە هاوڕێی گۆوارەکەمان دەزانین پێشنیارەکانیشت لە بەرچاو دەگرین.

سنە:کاک فایەقی یووسفی

نووسراوەکەتمان بۆبنێرە تا دوای لێکۆڵینەوە بڕیاری لە سەر بدەین.

بۆ سەرەتای شێوەی کوردستان

# سەرداری موسڵمانی کورد صلاح الدینی ئەییوبی

فارووقی دەلخوسرەوی

بەشی چوارەم

## کۆچی دوایی سوڵتان صلاح الدین

لەدوای ئەوە سوڵتان صلاح الدین چووە (قودس) و پاش رێک و پێک کردنی کاروباری ئەو شارە ویستی بچێتە حەج، بەڵام لەبەر مەترسی پەلامار هێنانەوەی خاچ پەرستەکان نەیتوانی بەو ئاواتە پیرۆزە بگا و بەرەو دیمەشق رۆیشت.

" رۆژی چواردەی سەفەری ساڵی ٥٢٩ ی.ک ( ١١٩٣ ی.ز)" چوو بەپیر حەجاجەوە و ئەم ئیستیقبالە زۆر قەرەباڵغ و رۆحانی بوو، تەئسیری تێ کرد لە نەچوونی بۆ حەج زۆر عاجز بوو و گریا، هەر ئەو شەوە لەرزی لێهات و رۆژ بە رۆژ نەخۆشی‌یەکەی گرانتر بوو نیهایەت رۆژی چوارشەممەوی ٢٧ی سەفەری ٥٨٩ ( ٤ی مارسی ١١٩٣ ی.ز) ئەمری خوای بەجێ هێنا، عومری ٥٧ ساڵ بوو". (١١)

مردنی سوڵتان صلاح الدین هەموو موسڵمانانی ئازیەتبار کرد. جیهانی ئیسلام کە چاوی بریبووە ئازایەتی و پیاوەتی و چاونەترسی و هێمنایەتی ئەم سەردارە دڵپاک و خواپەرستە، بە لەدەست چوونی ئەو خۆی بە مەری بێشوان دەزانێ.

ئاخر صلاح‌الدین تەنیا سوارچاکێکی توند و تۆڵ و شەکەتی نەناس وشیروەشێنێکی بێوێنە نەبوو،بەڵکوو ئامۆژگار بوو، مسکێن نەواز بوو،ڕێبەر بوو،ڕێبەرێکی وابوو کە باشترین ڕێگای بۆ سەرکەوتن بەسەر دوژمنانی نێوخۆیی و بێگانەدا دۆزیبۆوە.

دەیزانی کە بۆ زاڵبوون بەسەر خوو و خدەی ناپەسند و خۆ بە زل زانیندا دەبێ ئەهلی تەقوا بێ و لەکاتێکدا گەورەترین دەسەلاتی بە دەستەوەیە بەسەر نەفسی خۆیدا زاڵ بێ و خۆی لێ نەگۆڕێ، بەڵکوو وەک هەموو سەرکەوتنێک خوا داویە بۆ ی دیکەش یارمەتی لە خوا بخوازێ.

صلاح الدین ئینسانێکی دەست و دڵباز و داپەروەر بوو و زۆر بە روو خۆشیەوە خەڵکی فەقیر و هەژاری وەردەگرت و سکالای دەپرسین و دەستی دەگرتن. چەندە لەگەڵ دوژمنی بەرەورووم، سەخت و ڕەق و ئازا بوو، دوو هێندە لەگەڵ ژێردەستی خۆی بەرحم و بەدڵ و دەروون بوو دوژمنی قەستەسەری کە بەدیل دەگیرا لە ئەماندا بوو و هەموو چاکەیەکی لەگەڵ دەکرا هێندێک لە ئاکار و ڕەوشتی صلاح الدین لەم قسانەیدا دەردەکەوێ کە وەک ئامۆژگاریەک بە مەلیک زاهیری کوری گوتوە:

ئامۆژگاری صلاح‌الدین بۆ مەلیک زاهیری کوری:

" تەوسیەی تەقوات دەکەم کە مەبدەئی هەموو خێرێکە. ئەوی خوا ئەمری پێ کردوە منیش ئەمرت پێ دەکەم. چونکە سەبەبی ڕزگاریتە.

خۆت بپارێزە لە خوێن ڕژتن، چونکە خوێن ناخەوێ. دڵی ڕەعیەت ڕاگرەو تەماشای ئەحواڵی بکە چونکە تۆ ئەمینی من و ئەمینی خوای بەسەریانەوە،دڵی ئومەرا و ئەرکانی حکوومەت ڕاگرە چونکە موەفەقیەتی من لە سایەی مودارای خەڵکەوەیە. حەسوودی بە کەس مەبە چونکە ئەجەل مۆڵەتی کەس نادا، لە موعامەلە لەگەڵ خەڵکدا زۆر دیقەت بکەچونکە ئەگەر ئەوانت لێ ڕەزا نەبێ خوا عەفوت ناکا، بەڵام ئەوەی لە بەینی تۆ وخواتدا واقیع بێ بە تۆبەکردنێ لێت دەبوورێ،چونکە گەورە و لێبووره." ( ١٢ )

سوڵتان صلاح الدین باشی دەزانی کە تاقە ڕێگەی بەختەوەری جیهانی ئیسلام و سەرکەوتنی بەسەر دوژمنانی خوا و دینی خوادا یەکەتی نەتەوە موسڵمانەکانە و بۆ پێک هێنانی ئەو یەکەتیەش هەرچی پێی دەکرا کردی. لە ماوەی دەسەلاتداری ئەودا

## سوڵتان صلاح الدین باشی دەزانی کە تاقە ڕێگەی بەختەو... خوا و دینی خوادا یەکەتی نەتەوە موسڵمانەکانە و ب...

نموونەیەک سنکەی سەردەمی سوڵتان صلاح الدین

میسر و شام کە لەمێژ بوو شەڕ و کێشە و دووبەرەکیان لەنێودا بوو یەکیان گرت و وڵاتێکی گەورەی ئیسلامی لە کوردستانەوە هەتا توونس و یەمەن و عەدەن لەژێر دەسەلاتی سوڵتان صلاح‌الدیندا برایانە دەژیان و لە ئاکامی ئەو یەکەتیەشدا بوو کە پەلاماری بەرینی خاچ پەرستەکان تێک شکا و شاری قودس و بەشێکی زۆر لە وڵاتی فەلەستین لە چنگیان ڕزگار کرا.

سوڵتان صلاح الدین سەرەڕای ئەوەی پادشای وڵاتێکی ئاوا گەورە بوو ماڵی دنیای بەهیچ نەدەزانی و کاتێک مرد تەنانەت

## جیهانی ئیسلام و سەرکەوتنی بەسەر دوژمنا
## پێک هێنانی ئەو یەکەتی یەش هەرچی پێی دەکرا کرد

خانوویەکیشی لێ بەجێ نەما و وەک دەگێڕنەوە تەنیا ٤٧ درهەمی لێ بەجێ مابوو.

* * *

چۆن سەرکۆنەی ئەوانە

نموونەیەکی ترلە سکەی سەردەمی سولتان صلاح الدین

نەکەین کە ، بەبێ لە بەر چاوگرتنی وەزعی سیاسی و کۆمەڵایەتی و بیرو باوەڕی فەلسەفی ئەو سەردەمە ، پەلامار دەبەنە سەر صلاح الدین و بەوناوە کەگۆیا بۆکورد حەولی نەداوە تاوانباری دەکەن ؟

ئەگەر ئەوانە شارەزای مێژووی گەلی کورد و گەلانی دیکەی جیهان بان دەیانزانی کە پێش لەشۆڕشی مەزنی فەڕانسە ، هیچ شۆڕشێک بە ناوی ناسیۆنالیزمەوە لە دنیادا نەکراوەوئەو شەڕانەی کراون یا بەمەبەستی داگیر کردنی وڵاتانی دیکەبوون یا لەسەر ئاین و مەزهەب .

مەگەر خاچ پەرستەکان مەبەستیان لەو شەڕانە ناسیۆنالیزم بوو یاپەرەدان بە قەڵەمڕەوی مەسیحیەت و بەناو " رزگارکردنی گۆڕی حەزرەتی عیسا لە چنگ موسڵمانان " .

ئەگەر سەرنجێکی مێژووی گەلی کوردیش بدەین ، دەبینین کە یەکەم بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورد ، حکوومەتی ئەورەحمان پاشای بابان بووە. کە ئەویش هاوکات بووە لەگەڵ شۆڕشی مەزنی فەڕانسە .

کەوابێ نە بەعەقڵ و نە بەزانست ڕێی تێ ناچێ کە صلاح الدینی ئەییووبی لەو سەردەمەدا توانیبای بە ناوی کوردایەتی و ناسیۆنالیزمەوە تێبکۆشێ.

ئەمەش بە مانای دیفاع لە ناسیۆنالیزمی کوێر نیە .... ڕووی قسە لەو کەسانەیە کە خۆیان بەشتێک دەزانن و بە سووکی دەڕواننە پایەو نرخی خەباتی صلاح الدینی ئەییووبی ئەم سەردارە پایەبەرزەی کورد و جیهانی ئیسلام .

صلاح الدینێک کە هەموو گەلانی موسڵمان ، بەتایبەتی گەلی موسڵمانی کورد شانازی پێوە دەکەن و حەقی خۆشیەتی .

**هەر نەمر بێ یادی ئەو گەورە پیاوەی جیهانی ئیسلام و گەلی کورد .**

**تەواو.....**

**پەراوێز**

١١ ـ کوردستان و کورد ـ ئەمین زەکی بەگ ل ـ ١٧٦

١٢ ـ کوردستان وکورد ـ ئەمین زەکی بەگ ل ـ ١٧٩

" سەرچاوەکان "


١ ـ شەرەفنامەی شەرەفخانی بتلیسی . وەرگێڕاوی مامۆستا هەژار چاپی دووەم

٢ ـ کورد و کوردستان ـ ئەمین زەکی بەگ

٣ ـ تاریخ قرون وسطی ـ آلبرماله ـ ترجمه میرزا عبدالحسین هژیر .دنیای کتاب

٤ ـ سرگذشت فلسطین ـ کارنامۀ سیاه استعمار ـ تالیف استاد اکرم زعیتر ـ ترجمه علی‌اکبر هاشمی رفسنجانی

٥ ـ صحنەهای تکان دهنۀ در تاریخ اسلام ـ علی دوانی

کەروێشک گواندارێکە کە نینۆکی هەیە ، گیاخۆرە ، کلکی زۆر قوڵەیە ، تووکی نەرمە، درێژایی لە بەرزایی پترە ، پێشووی لە پاشووی کورتترن ، بەباز و قونە دەڕوا ، گوێی زۆر درێژن، سەری لەچاو لەشی زۆر گەورەیە ، چاوی زەق و لەروون و نانووقێن زیاتر بە چاوان دەبیندرێتەوە، دەڵێن مێ یەکەی حەیز دەشوا ، دەترەکێ و زاو زووی زۆرە ، لە جێگای سارد وگەرمدا هەیە لە بژوێنترین کوێستانی کوردستاندا و گەرمترین و کراترین بێرووني عەرەبستاندا دەژی، بە بێچووی دەڵێن بەچ و کە

بۆ باغ ، بێستان ،شیناوەرد و رەپستە تەنانەت خۆیان و خەرمان وەک بەڵا وایە بۆیە وەرزێر و باغەوان رقیان لێیە و بە تەپکە و تەڵە و خوردە و داو دەیگرن. گۆشتی دەخورێ ، دەڵێن تەمەنی بەوە را دیارە کە هەر ساڵە کونێکی لەبن کلک دەبێ .

نیزیکەی سی ، چل ساڵ لەوەی پێش کەم ساحێب ملک و ئاغا و مەزنی کورد هەبوو، رموودەی راوە کەروێشک نەبێ ، دیارە ئەم کارەش بەستە بە دەست رۆین و نەرۆینەوە بوو ، ئاغای دەوڵەمەند

# راوەتاژی

نووسینی: هێمن

پەڕەوازە بوو و توانی توند رابکا "سەپسێنی" پێ دەگوترێ ، بە رواڵەت یەکجار بەستەزمان و بێدەسەلات و ترسەنۆکە لەبەر هیچ گیانداری چوارپێ و باڵندەی پچووکی راوێ دەسناکاتەوە، کەچی دژمنی وەرزێر و رەزەوان و بێستانچی یە . تا دەستی لەسەر دابنێی بەزەڕ و بەدفەڕە ، بە رۆژ لە لاِندا خۆی مەڵاس دەدا و بەشەو دەگەڕێ و دەلەوەڕێ ، هیچ ناپارێزێ ،

رستەیان لە ئاوریشمی رەنگاو رەنگ دەهۆنییەوە و گوڵێنگی سیمپێچی جوانیان وێدەخست سەری گوڵێنگدا ریان لە باسکی راستە یا راست و چەپ لەشان دەکرد . قەلادەیان لە قایشی باش دروست دەکرد و بە ئاورێشم دەچنی ، زەنگوڵەی زەرد ، زێو تەنانت زێڕیان لێ دەدروو، سەری دیکەی رستەیان لە ئاڵقەی قەلادە هەڵدەکێشا . ئاغا دێ بە خۆی و باب نۆکەر و رەعیەت

سوارەوە دەچووە ڕاو، لەو جێگایەی زانیبایان کەروێشکگرە راویان دادەبەشی و سوار سەفیان دەبەست، لەکێو یا بانوو سوارێک بە تاژی یەکی کارامەوە سەر راوی دەگرت، سەر راو دەبوو لەپێش سواراندا بێ و چاوی لەلای خوارێ بێ تا ئەگەر کەروێشکیان لە داوێنێ تێ بەر دا وریا بێ و بزانی روو لە کام لا دەکا، ئەو سواران کەمتر بایە، کەروێشک چاکتر دەبیندراوە یا زووتر هەڵدەهات، لانی تازە و کوێرە ولانی شەوێ دینێ نیشانەی ئەوە بوو، کەروێشک هەر لەو دەور و بەرەیە، جا دەبوو بە فیتوو یەکتر حالی بکەن، سەف راستتر و سوار خوردتر بن، ورد بڕوانن و نەیبوێرن، کەم وایە کەروێشک لەبەر سەفی راست و رێک و پێک

دەبوو راستە و راست لە پێشدابێ، ئەگەر تاژی خوارەوە نەیانکوشت و بە ماندوویی گەیشتە سەر راو ئەو تاژی یەکەی خۆی بەر داتێ، دەبوو تاژی سەربەرەژێژ بەر نەدا و راوەستێ تا کەروێشک کەمێکی لێ رەت دەبێ، بەر راو سوارێک بوو کە باشترین و چێ ترین تاژی پێ بێ و کەمێک لە دوای سوارانەوە بێ تا ئەگەر کەروێشک پاش راو بکا، تاژی خۆی تێ بەر دا، سوارەکانی دیکە کە نێوانیان پێنج، شەش گەز پتر نەبوو، چ تاژی یان پێ با یا نەبا دەبوو لە رێکی یەک بڕۆن و هەر کەسە لە لای سەرووی خۆی ورد بڕوانێ و هەوڵ بدا هیچ بن پنچک و بەردێک نەبوێرێ، تا سەف راستتر و نێوانی و سواری ئارام بوێرێ رابکا، خۆی لە لاندا مەڵاس دەدا و لە عەرزی دەخا. راوکەری لێزان بە تەماڵ دەیبینێتەوە.

ئەو سەردەمی داب بوو ئەگەر نۆکەرێک یا رەعیەتسوارێک تەماڵی دیباوە دەیگوت: "نۆکەری ئاغای خۆم و راوکەرانم پێ دەڵێن هۆی تەماڵە" عادەت وابوو ئاغا و خزمەکانی تەماڵانە بیدەن بەو راوکەرە و خەڵاتی بکەن، سوار لە دەورەی تەماڵ کۆ دەبوونەوە، پایزە، ئازیزە، گوڵێ گوڵێ، حەیران و گەلۆیان لەسەر دەگوت و جار و بار دەهۆڵ و زورنا و سێ تەپڵیشیان لەسەر لێ دەدا، ئەگەر بۆ خاتری سەیر نەبا بە هاسانی بەدەستی دەگیرا، بەڵام ئاغای گەورە بۆ

سەیر دەچوونە راو نەک بۆ راوە گۆشت ، جا بۆیە ئەسپیان وەسەر دەپەڕاند کە هەلێ و تاژی تێ بەر دەن ، دوو یا سێ تاژی یان تێ بەردەدا ، ئی وابوو چێ و دمگەرم بوو گوریسێکی نەدەبرد و لە سەفی سواران دەرنەدەکرد و هەلێدەگرت و ئی وابوو خێرا و پەل و دمسارد بوو ، چەند جاری دەگێڕاوە ، لێی دەدا ، تێی رۆ دەهات تا هەر خۆی یا تاژی یەکانی دیکە دەگەینە نۆرە و هەلیان دەگرت ، تاژی رەسەن کە کەروێشکی هەلدەگرت نەیدەشەمزاند یا بە دمیەوە دەگرت یا چەمۆلەی لەسەر دادەدا ، سوارێک دادەبەزی و سەری دەبڕی و وە بەن سامورتەی دەخست ، ئەگەر تاژی خوێری بایە نەیدەشکاندەوە و خوارەی پێ نەدەکرد و کەروێشک رزگار دەبوو ، ئەگەر باشتر بایە راستی دەکرد و دەیگەیاندە سەر ڕاو یا لە کونی دەکرد .

کەروێشک هەمیشە بۆ لێ قەومان کونێک رەچاو دەکا ، بەلام تا زۆری بۆ نەیە ناچێتە کونەوە سەرراوی شارەزا لای کونێ یان لێ دەگرت وادەبوو لە زارکی کوندا دادەنیشتن و ئەویش خۆی لە باوەش داویشتن ئەگەر چوو لە کونیشەوە بە پێچەک دەریان دەهێنا ، لە هیندێک مەلبەند بە تەمال دەلێن دیاردی .

خۆشترین کاتی راوەکەروێشک پاشبارانە. چونکە کوێرە و لانی تازە لەدوورەوە دیارە وادەبێ کەروێشک لەو کاتەدا کۆنە لان دەکاتەوە کە ئەویش دۆزینەوەی بۆ راوکەری شارەزا هاسانە ، جگە لەوە بەر پێی تاژی کە رووت و بلە نەرم دەبێتەوە و ترسی کالە دڕانی نامێنێ ، بەرپێی کەروێشک کولکنە و قوڕ دەگرێ و باش ناتوانێ رابکا و پێی دەلێن کەلاشە کردن ، ئەو سەردەمە زۆری پێ ناچێ و وەختی نینۆک شکێن دێ، کەوشکەبەند پەیدا بوو و کەروێشک لانی بەرەژێری کردەوە و رەپستە و باغی پاوانی داوە بەر پەلامار هیند قەلەو دەبێ کە دەلێن گورچیلەی لە بەزی دا ون بووە ، ئەمجار بەسەر زەوی بەستراو و رەق دا واهەلدێ هەر ویزەی لەبەر پێی دێ ، تاژی لە ترسی هەلخلیسکان و نینۆک شکان ناوێرێ توند رابکا ، هەر تاژی یەکی لە کاتی نینۆک شکێن و سیخوار لە پشتدا بگاتێ نایابە.

کە نوا بەفری هەوەل کەوت و بارنی نەکرد باسی سەری کەروێشکە ، چونکە شوێنی دەگەڕێ و بە پێشووی کورتەوە هەردەر ناچێ ، ئەو گیاندارە بە روالەت گێل و گێژە کە زانی شوێنی دەگەڕێ زۆر فێلەزان دەبێ ، شوێنی جووتەیە ، پاشووی بە جووت وەپێش پێشووی دەخا ، راوکەر کە تووشی راستە شوێن هات ، دەزانێ کەروێشک یا چۆتە شەو گەڕ یا گەڕاوەتەوە و بەپەلە دەیگێڕێ تا دەگاتە دوولایی ، دوولایی ئەوەیە کەروێشک بەسەر شوێنی خۆیدا دەگەڕێتەوە ، لە جێگایەک بازێکی بلیند داوێ و لەسەر کەلەکێک یا لەقەدی

رەوەزێک دەکەوێ ، دەبێ راوکەر بە قەزاغ دوولایی دابڕوا و نەیشێلێ تا بزانێ کەروێشک لە کوێ بازی داوە و وریا بێ پاش راو نەکا و بازرە نەبێ ، هەزارە هەر وەک دوولایی وایە ، بەلام کەروێشک

چەندین جار بە شوێنی خۆیدا هات و چــۆ دەکا ، وا دەبێ هەر لەنێو هەزارەدا . . دەکەوێ وادەبێ دیسان بازێکی دوور داوێ و لەهەر جێگایەک کەوت مات دەبێ شوێنگێڕی باش لە فێڵ و هەزارە و دوولایی کەروێشک دەگا و دەیدۆزێتەوە.

کوتە ئەوەیە کە کەروێشک پاش هەزارە و دوولایی بەقەد جێ جێخوونێک بــە دەورە دەگەڕێ و ئەوەندەی پێدا دێ و دەچێ کــە کەس سەرە دەری لە شوێنی ناکا ،راو ــ کەری شوێنگێڕ دەبێ زۆر بە سەرنجــەوە دەورەی کوتە بدا کە نەرۆیبوو، ئەوەدیارە لەنێو کوتەدایە ئەو دەم دەبێ وەنێــو کوتە بکەوێ ، تا یا بیدۆزێتەوە یــــا ناچاری بکا هەڵێ . کە بەفر زۆر بوو و بەفر بە سەریش نەبوو کەروێشک رونــوو بەفر دەکۆڵێ و دەچێتە نێو بەفرەوە بەوە دەڵێن خوزە، کەروێشک لە خوزەدا بــەوە دیارە کە جێی هەناسە هەڵکێشانی زەرد دەبێ و دیارە ، لێرەدا فێڵێک دەکا بــە بن بەفر دارەهەندێک دەکۆڵێ و لە چەنــد جێگا خوزە دیاری دەدا بۆ ئەوەی ئــەو فێڵەشی لێ ببڕن ،یەکێک بــە تاژیــەوە لە نێوەڕاست رادەوەستێ و ئەوانی دیکــە خوزەکان دەشێلن ، کەروێشکی خوزە زیاتــر ناوێرێ رابکا و بە دەستی دەگیرێ لـــە پێشدا گوتم کەروێشک تا زۆری بۆ نەیــە ناچێتە نێو کون کە چووە نێو کــون و دیار بوو و دەستی نەگەیشتێ، دارێکــی نەرم و درێژ دێنن سەری لەلە دەکــەن و لە تووکی کەروێشکی با دەدەن و بــەم دارە دەڵێن پێچەک ئەگەر بەوەش نەهاتە دەر ئەمجار تەڵەی لێ دادەنێنەوە و دەیگرن ، لە مانگی رەشەمەدا راوەکەروێشک دوایی دێ ، هەم لاواز دەبێ و بــۆ خواردن نابێ هەم با دەگرێ ، بەنـــاو بانگترین چێشتێکی لە گۆشتی کەروێشکــی دروست دەکەن سەنگە سیرە ، لە کابانــان بپرسن چۆن ساز دەکرێ !!!

**ـ راوە رێوی بە تاژی ـ**

کام مندالی کوردە ناوی رێــوی نەبیستبێ ، سەدان ئەفسانە لەسەر رێــوی لە فۆلکلۆری کوردیدا هەیە ،خۆ لە پەنـدی پێشنیانیشدا ئەوەندە باسی رێوی کراوە هەر مەپرسە وەک :

رێوی خۆی لە کونەوە نەدەچوو ،قانگەلاشی بە کلکیەوە دەبردە ژوور، رێوی دەمــی نەدەگەیشتە ترێ دەیگوت ترشە ، وەک رێوی کێچی دەکەولی کەوتووە ، وەک رێوی خــۆی لە ئاوی خوڕ نادا ، راوی رێوی بۆ کەولێــە و سەیری لە راوە رێوی خۆشترە ،وەک رێوی سیرمەخۆرە .....

رێوی بە راستی جانەوەرێکی فێڵاوی و مەکربازە ، نەوسن و بەزەرە ، هەمووشت دەخوا میوە و گۆشت و شتی وا ، دژمنی کەروێشک و مشک و باڵندە بە تایبەتی باڵندەی پێرۆیە ئەوەندەی کەروێشک بۆ باغەوان و وەرزێــر خراپە ئەویش ئەوەندە بۆ ئەوانــــەی باڵندەی کەوی و ماڵی رادەگرن جێگــای مەترسیە ، تووشی رەوە قەلەموونێک بــێ تاقی لێ دەبڕێ ، مریشک و جووجک هــەر ناهێڵێ ، لە کێویش هەمیشە لە کەو سوێسکــە و زرەکە و هەوێردە لە کەمیندا ، تەنیــا کاری چاکی خواردنی مشکی کێوی و بەچــە کەروێشکە ،بەڵام ئینسان فێڵی لەویــش

دەبرێ ، بەڕاستی راوە رێوی سەیری خۆشە ، رێوی لە کوردستاندا زۆرە ، وەک دەڵێن راوی بۆ کەولیلە، دەنا گۆشتی ئەگەرچی دەیخون زۆر دزێو و ناشیرینە، دەڵێن وەک گۆشتی ژووشک بۆ باداری دەرمانە .

بەڕاستی هەقیانە ئەو کەسانەی دەڵێن " سەیری لە راوە رێوی خۆشترە ،راوە رێوی زیاتر بە پیادە دەکرێ ،رێویش وەک کێوی کە ترسا هەمیشە تیرەگی کێو دەگرێ و بۆ کە ترسا هەمیشە تیرەگی کێو دەگرێ و بۆ کێوێکی دیکە دەپەڕێتەوە . دیارە ئەو لە کێو و شاخی زۆر ئەستەمدا تاژی لەهەموو

جێدایەک تەنانەت لە دەشتی نەرمانیش هەیە ، دوو دەستە کێومالْ کێوێک دەتەقێنن و هەرا و هوریایەکی زۆر دەکەن تا رێوی بترسێ ، راوکەرێک لە حاشارگەدا بەرەگەی لێ دەگرێ تا کێومالەکان رێوی وا دەتەقێنن بەسەر بەرەگەدا بکەوێ،ئەو دەم بەرەگەگر تاژی تێ بەردەدا ، تاژی زۆر کارامە و ئازا نەبێ ناوێرێ رێوی بگرێ،رێوی کە بێ باز و بردە لەبەر تاژی دەرناچێ، بەڵام دەستی دەگەڵ دەکاتەوە، گازی لێ دەگری ، بە نینۆک دەیرنێ ، تاژی کارامە هەوڵ دەدا لە پشت ئەستۆی رۆ بێ و رایوەشێنێ تا لە کاری دەخا یا لە قەفەزەی پشتی رۆ بێ و هەڵیدێرێ تا بڕستی لێ دەبرێ

بۆ راوە رێوی پێویست ناکا تاژی خێرا بێ ، ئەسڵەن تاژی رەشکۆژ و چێ لە رێوی بەرنادەن تاژی رێوی کۆژ ئازا و قایم بێ باشترە نەک تیژ و گورج،

دوڕە یا دووڕەگ بۆراوە رێوی باشترە .دوورەگ وەک لە ناوەکەیەوە دیارە جنە سەگێکە لە جووت بوونی سەگ و تاژی پەیدا بووبێ ، جا فەرق ناکا گۆڵ، سەگ بێ یا تاژی ، هەرچەند ئەگەر گۆڵ تاژی بێ دووڕەگ جوانترە ، دووڕەگ لە باسکە سەگ رووتەتر و بەرزەلینگ ترە و لەپاش تاژی لە هەموو جنە سەگێک توندتر رادەکا ، ئەی زۆر خێرایان لێ هەڵدەکەوێ کە بۆ راوە کێوی و کەروێشک تەنانەت گورگیش بەکار دێ ، تۆرەمەی دوورەگ و تاژی ، پێی دەگوترێ قەدەم .

خوێنەری خۆشەویست! بەم باسە دوور و درێژە ماندووم کردی با نەقڵێکی خۆشت بۆ بگێرمەوە ، کەمێک بێیەوە سەرەخۆ ، دەڵێن رۆژێک رێبوارێک تووشی راوکەرێک هات ، تاژی یەک و تولەیەکی کونێ و دارێکی درێژ و تەڵەیەکی پێ بوو ،گوتی کاکە ئۆغر بێ چ دەکەی ؟

ـ دەچمە راوە رێوی

ـ ئەدی ئەوانە چن پێتن ؟

ـ کاکە ئەگەر رێوی لەبەرم هەڵات ، ئەوە تاژی یەکەی تێ بەردەدەم، ئەگەر کوشتی باشە، دەنا لە کونێی دەکا ، کە کونەکە زور قووڵ نەبوو ئەمدارەی لێ پێچەک دەدەم ، دەیهێنمە دەر، ئەگەر زۆر قووڵ بوو، تولەکەی لە باڵ دەکەم .

ـ ئەگەر ئەویش بۆی نەهاتە دەر تەڵەی لێ دادێنمەوە ئاخری پێوە دەبی "

رێبوار گوتی :

ـ "کە وابوو بۆ رێوی خودا ماوە و بەس"

# معرفی کتاب

سیاحتنامهٔ اولیا چلبی

اولیا چلبی یکی از نزدیکان دربار سلاطین عثمانی بوده و ضمن ماموریتهائی که از دربار عثمانی به او محول میشد، به نقاط دور و نزدیک جهان و مخصوصا به مناطق مختلفی از قلمرو حکومت عثمانی سفرکرده و مشاهدات خود و نتیجهٔ تحقیقاتش دربارهٔ وضعیت جغرافیایی، تاریخی و رویدادهای مختلف تاریخی و فرهنگ مردم هرمنطقه را بصورت بسیار دقیق و موشکافانه‌ای به رشتهٔ تحریر درآورده و حاصل این تلاشها را در سیاحتنامه مفصل خود گردآوری کرده است........

..... کتاب حاضر ترجمهٔ بخشی از سفرنامه اولیا چلبی است که به گشت و سیاحت او درمناطق مختلف کردستان ترکیهٔ امروز مربوط میشود و استاد بزرگواری چون سعیدناکام آن را از زبان ترکی به کردی ترجمه و تحت عنوان " کرد در تاریخ همسایگان" انتشار داده است. اینک ترجمهٔ فارسی آن به علاقمندان به تحقیق در فرهنگ و ادبیات و تاریخ و گذشتهٔ مردم کرد تقدیم میگردد.

# کتێبی تازه

ئەم کتێبانە بڵاوکراونەتەوە :

١ ـ دیوانی نالی :
بەشەرحی ماموّستا مەلاعبدالکریمی مدرس و کوڕەکانیەوە.

٢ ـ دیوانی وەفایی:
بەشەرحی ماموّستا محمدعلی قەرەداغیەوە.

٣ ـ شاری وێران :
نووسینی عەلی حەسەنیانی "هاوار"

نووسەر: تی.واشینگتۆن

- کۆیلەی ڕاپەڕیو :
  وەرگێڕ: م . بەهرەوەر
- کاروانی خەیاڵ : بەشێک لە شیعرەکانی خالیدی حیسامی ( هێدی )
- یادداشتهایی از کردستان : خاطرات شیخ رئوف ضیائی.بە کوشش ( عمر فاروقی)
- قاموسی زمانی کوردی : دانەر: م . ڤ . نەبیحی
- بسوی جهان جاویدان : اثر ملا عبدالله احمدیان .
- فەرهەنگی ناوە دوانەکانی کوردی : دانەر : تاها فەیزی زادە .

## چاوەڕێی بڵاوکردنەوەی ئەم کتێبەش بن

ترجمهٔ ریاض الصالحین
از سخنان حضرت سیدالمرسلین
تالیف : یحیی بن شرف الدین نووی
ترجمه : احمدحواری‌نسب "ابوسعید"

---

### فۆڕمی ئابوونمانی گۆواری سروە

من ........... سەد و دە تمەن ( ١١٠ ) پووڵم بە حیسابی ژمارە ٥۴٠٠ ی بانکی سپە ، شوعبەی مەرکەزی ورمێ، ( اورمیە ) بە ناوی ئینتیشاراتی صلاح الدینی ئەییووبی بۆ ناردوون . داوا دەکەم لە ژمارە ............ ی سروە بە دوام جار لە گەڵ جار بۆ بنێرن ، ناو نیشانم ئەمەیە :

ناونیشان : ........................................

........................................

دەنووسێ :

" بریا بۆم کرابا بەرامبەرە لاوەکی‌یەکانیشم لە قامووسەکەمدا هێنابان"

( بڕوانە فەرهەنگی "معین" ج١، چاپی ٥، ١٣٦٢ ژێرنووسی ل پەنجاوحەوت )

پێویستە بەرەی تازە پێگەیشتوو ،خۆی ئامادە بکا بۆ پێداچوونەوەی ئەم فەرهەنگە یا بۆ داڕشتنی قامووسێکی ئەمڕۆیی .

خوێنەری خۆشەویست ، ئیدیعا ناکەم کە هەموو کەمو کووڕی‌یەکانی " فەرهەنگی‌خاڵ"ـم دەست نیشان کردووە ،یا ئەوەی کوتوومن راست و دروست و بێ هەڵە و پەڵەیە بەتایبەتی لێرەدا باسی ئەوەم هەر نەکردووە کە لەم کتێبەدا مانای بەشێکی زۆر لە وشەکان ناتەواو، یا نادروست و هەڵەیە ،چونکوو دەست نیشان کردنی تەواویان نیازی بە کتێبێکی سەربەخۆیە و لەم وتارەدا جێگای نابێتەوە ،**تکات لێ دەکەم تۆش بە بنج و بناوانی نووسراوەکەمدا بچۆوە خوار. هەڵە و پەڵەکانم پێڕابگەیەنە تا رادەی زانستی هەردووکمان بچێتە سەر ،ئاواتە خوازم ئەوانەش‌کە دەیانەوێ ئەرکی گرینگی قاموس نووسی بە ئەستۆ بگرن بە شارەزایی یەکی زیاترەوە ئەم کارە بە ئەنجام بگەیەنن .**

**مراکز فروش مجله سروه**

| | | | |
|---|---|---|---|
| **تهران** | :کتابخانه طهوری ،روبروی دانشگاه تهران | **سقز** | :کتابفروشی محمدی ،جنب مسجد جامع |
| **تبریز** | :مطبوعاتی ملازاده ، خیابان امام | **بوکان** | :کتابفروشی صالحی ،خیابان انقلاب |
| **باختران** | :نمایندگی اطلاعات ،بلوار شهیدبهشتی | **نقده** | :کتابفروشی خیام ،جنب ژاندارمری |
| **باختران** | :مسجدامام‌شافعی، میدان جوانشیر | **روانسر** | :کتابفروشی سعادت ،روبروی بخشداری |
| **سنندج** | :نمایندگی اطلاعات ،خیابان فردوسی | **پاوه** | :کتابفروشی بیان |
| **ارومیه** | :انتشارات صلاح الدین،خیابان‌شهید باکری | **بانه** | :کتابفروشی ناجی |
| **ارومیه** | :کتابفروشی حسینی ،شهرک فرهنگیان | **اشنویه** | :کتابفروشی نالوسی |
| **ارومیه** | :کتابفروشی ترمینال،ترمینال شهرستانها | **سردشت** | :نمایندگی اطلاعات |
| **مهاباد** | :نمایندگی اطلاعات ،فلکه شهرداری | **سردشت** | :کتابفروشی معارف |
| **مهاباد** | :کتابفروشی موفقی،روبروی بانک ملی | **پیرانشهر** | :کتابفروشی رازی |
| **مهاباد** | :کتابفروشی خانی،میدان ملا جامی | **پیرانشهر** | :کتابفروشی غزالی |
| **مهاباد** | :کتابفروشی ملاجامی،میدان ملا جامی | **پیرانشهر** | :کتابفروشی سعدی |
| **مهاباد** | :کتابفروشی حمیدی ،جنب مخابرات | | ★★★ |

**روون کردنەوەیەک لەسەر فۆڕمی ئابوونمان**

**ئەو ١١٠ تمەنەی کە دەینێرن بۆ ئابوونمانی شەش مانگ یا ساڵێک نیە ، بەڵکوو بۆ شەش‌ژمارەی " سروە "یە کە خەرجی پۆست‌کردنیشی خراوەتە سەر ، دیارە بۆ داخوازان لە دەرەوەی وڵات زۆر و کەمی زێدە خەرجی پۆستیشی دێتە سەر، کە بۆ خۆیان دەتوانن بەراوردی بکەن . لەبیرتان نەچێ لەگەڵ ئەم فۆڕمە فیشی بانکیشمان بۆبنێرن .**

**اورمیه : صندوق پستی ٧١٧ ، تلفن ٣٥٨٠٠٠**

ناوەندی بڵاو کردنەوەی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی

ئینتیشاراتی صلاح الدینی ئەیووبی

تێبینی : لە سەر[illegible] نەوەی ئەم جەدوەلەدا هەموو ئوسوولی رێنووسی کوردی بە پێی رێ[illegible] هەڵبژێردراوی ئەم گۆوارە رەچاو کراوە جگە لەوەی نیشانەی[illegible] انەنراوە. واتا ئەگەر بۆ وێنە وشەی (شڕ، کوڵ، زۆر، شێرو ..)ی تێد[illegible] بە شکڵی (شر، گول، زور، شیرو ..) دەنووسرێ.

| ١٥ | ١٤ | ١٣ | ١٢ | ١١ | ١٠ | ٩ | ٨ | ٧ | ٦ | ٥ | ٤ | ٣ | ٢ | ١ | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | | | | | | | ■ | | | | | | ١ |
| ■ | | | | | | ■ | | | | | | | | | ٢ |
| | | | | ■ | | | ■ | | | ■ | | | | | ٣ |
| | | ■ | | | | | | ■ | | | ■ | | | | ٤ |
| | ■ | | | | | ■ | | | | ■ | | | | | ٥ |
| | | | ■ | | | | ■ | | ■ | | | | | | ٦ |
| | ■ | | | | ■ | | | | | | | | ■ | | ٧ |
| | | | | | | | ■ | | | ■ | | | | | ٨ |
| | | | | | ■ | | | ■ | | | | | ■ | | ٩ |
| | | | ■ | | | | ■ | | | | | | | | ١٠ |
| | | | | | | | | ■ | ■ | | | ■ | | | ١١ |
| | ■ | | ■ | | ■ | ■ | | | | | ■ | | | | ١٢ |
| | | | | | | | ■ | | ■ | | | | ■ | | ١٣ |
| | | ■ | | | | ■ | | | | ■ | ■ | | | | ١٤ |
| | | | | | | | | | | | | | ■ | | ١٥ |

١- نازناوی پێشووی مەحوی شاعیری بە ناوبانگی کورد- ئەوریێوی وسەگو پشیلانەی بە دزییەوە ئازووقەی ماڵ دەخۆن و هەر وەها ئەویەکسمو رەشە وڵاخانەی دەچنە نێو زەرعاتی خەڵک و زیانی دەکەن. ٢- ناوچەیەکی شاخاوی لە کوردستانی ئێران و عیراقدا- ناوی پچووکی یەکەم فەزانەوەردی جیهان ٣- دوعای بن لێو- دەنگ دانی مەڕ- هەر ساڵێکی جانوو دەیبڕێ- ئەوەی پێی موسڵمانین. ٤- پیتێکی ئەلف وبێ - بە مریشک دەڵێن تا بڕوا- ساڵ و زەمانان لە لادێ بە دەسەڵات بوو- یەکی تەواویش نیە. ٥- کەسەری بێ سەر- کەرستەیەکی قوڕەکاری کە بە مردوویی بەکارنایە- نیۆک. ٦- بە عەرەبی بە کێوی و نەزان دەڵێن - هەرگیز- بۆ دەنگدانی ئەسپ و ماین دووجار بیڵێ. ٧- ئاگا لە خۆ بڕاو- بێدەنگ بە. ٨- دارهەنە و رایەڵ وپۆو کەرکیت ساز کەو هەڵی ئاوەسە- لەتکی بەڕە- باڵندەیەکی قەڵەوی نێو شیناوەردە. ٩- لەوەتا- هەم کەوان هەیەتی هەم ساز- بۆ زستان دایدەخەن. ١٠- پیتەختی ئیتالیا - تەپۆڵکە. ١١- ئەگەر شتێک بدرێتە دەستی کەسێک دەڵێن ...وەری بگرە- لە سەری هۆگان جووتیار بۆدەنگ دانی گا دەیلێ - بۆ تاقی کردنەوەی هۆش دایدەهێنن. ١٢- سوڵتانی قودس کە لە شەڕی خاچ پەرستیدا بە دەستی سوڵتان صلاح الدین بە دیل گیرا- دەنگی گوللە. ١٣- شارێکە لە کوردستانی تورکیا- نەجار کۆمۆد و دەرک و شتی وای لێ ساز دەکا. ١٤- گراوی مەم - گەوهەرێکی بایی دارە و لە لەهجەیەکی کوردیدا بە مانای نێوە- دژی گۆڕایی - گوم. ١٥- لە ئاخرو ئۆخری زستاندا پەیدا دەبێ.

١- شاعیرێکی پایەبەرزی کورد. ٢- خشڵ و زیوەری ژنان - گرتن یا کوشتنی گیان لەبەری کێوی ٣- پاڵەوانی بەیتێکی کوردی - پیغەمبەری نێو زگی ماسی. ٤- درشت نیە ولە گەڵ درشت دەبێ بە هەمووشت - زۆرخۆر تووشی دەبێ. ٥- وشەی رێزگرتن لە ژنان - وشتر دەیخوا - کەوتنی تووش بوونە. ٦- راهێنان - وشیار و زرینگ - لووت. ٧- دەم- برینجی پڵاوی لە سەر رۆدەکەن تا هەڵچۆڕی- بووکی لێ پیرۆز بێ. ٨- دراوی ژاپۆنی - دەفر و ئامانی گڵی تێدا سوور دەکەنەوە- ئێمەی موکریانی - رێگا ٩- لە بەر چی - پێتەختی وڵاتێکی گەورەی ئیسلامی ئەفریقا ١٠- نێوەڕاستی چۆم و رووبار- "وتی" بە زاراوەی کرماشانی- بە خانەوە بە نێوشاری سەقزدا دەڕوا. ١١- یەک بە زاراوەی هەورامی - سەرمای دوای چلان. ١٢- ئی مێوژە رەشکەی خۆشتر و باشترە- بەرق هاتو چۆی پێدا دەکا - مێشک. ١٣- غیرەت - زمان شڕی. ١٤- ساکار نیە و دێخ دێخە- بۆ خانووبەرە لە هەمووشت پێویستترە- تازە نیە. ١٥- بەیت بێژی بەناوبانگ و خۆشەویستی ئەو رەحمان پاشای بابان.

## پڕکراوەی جەدوەلی ( ٣ )

| ١٥ | ١٤ | ١٣ | ١٢ | ١١ | ١٠ | ٩ | ٨ | ٧ | ٦ | ٥ | ٤ | ٣ | ٢ | ١ | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ن | ی | و | ک | ■ | ن | ا | ر | ی | ە | ت | ی | ق | ە | ف | ١ |
| ز | ا | ر | و | ە | ە | ■ | و | ا | و | ■ | ە | ر | و | ە | ٢ |
| ا | ل | ■ | ن | ا | ت | س | ی | ە | ز | ■ | ک | ە | ن | ر | ٣ |
| ■ | و | ە | ە | ■ | ر | ت | ش | و | ■ | ە | ە | ■ | ی | ە | ٤ |
| ر | ب | ی | ک | ■ | ە | ر | ت | و | ت | ■ | ■ | ب | ن | ە | ٥ |
| ن | ژ | ر | و | ک | ■ | ا | ن | ■ | ی | ت | ا | ە | ە | ن | ٦ |
| و | ■ | ا | ت | و | ی | ن | ■ | ک | ش | و | ■ | ر | و | گ | ٧ |
| و | ە | ن | ر | ب | ■ | ب | ی | ت | ک | ■ | د | ز | ە | ی | ٨ |
| ■ | ە | ■ | ■ | ە | و | ی | ر | ک | ■ | ش | و | ە | ■ | خ | ٩ |
| ک | و | ی | س | ■ | ن | ژ | ■ | و | و | ت | ی | ف | ■ | ا | ١٠ |
| ن | ا | و | ژ | ی | ج | ■ | س | م | ■ | و | ■ | ر | ە | ل | ١١ |
| ■ | ر | س | ■ | ە | ر | و | و | ش | ■ | م | د | ■ | ە | ■ | ١٢ |
| ل | ە | ف | ە | ک | ■ | ش | ی | ک | ل | ە | ە | ی | ت | ■ | ١٣ |
| ا | ب | ■ | ■ | د | ن | ە | ر | ■ | ی | ک | ■ | ە | ی | س | ١٤ |
| ن | ی | ش | ە | ل | ی | ک | ■ | ر | و | ■ | ە | ک | و | ل | ١٥ |

لەنێو ئەوکەسانەیدا کەپڕکراوەی دروستی ئەمجەدوەلەمان بۆبنێرن بەپێی قورعە یەک کەس بە بەرندە دەناسرێ. جایزەی بەرندەی جەدوەل بریتی یەلەساڵێک ئابوونمانی گۆواری سروە . بەرندەی جەدوەلی ژمارە ٣ کاک مستەفا شێخە بوو لە گوندی بابخالاویی شنۆوە.



★ ★ ★

گوزاریشێکی زانستی - کۆمەڵایەتی

ئامادەکردنی: قوربان عەلی کەریمی
بەهاوکاری: دوکتۆر سەمەدی قابیلی

# نەخۆشی گولی لە مەلبەندی موکریاندا

**وێڕای دەستەیەک لە لێپرسراون و بازاڕیەکانی شاری مەهاباد بۆ دیتن و چاوپێکەوتنی ئەوانەی لە نەخۆشی گولی رزگار بوون** بەرەو گوندی سەرچناری گولان دەچووین . پاش نێوان مەهاباد و میاندواو ، لامان داجادەیەکی خاکی کە بۆ دێی "سەرچنار" دەچوو.

هەوەڵ جار نەبوو دەهاتمە ئەو دێیە ،بەڵام زوربەی ئەندامانی دەستە یەکەم جاریان بوو دەهاتنە دێ گولانێک . لەدوای دەکیلۆمیتر گەیشتینە نێو دێ و دابەزین . خەڵکی دێ کە دیار بوو زوربەشیان شەکەتی دەستی نەخۆشین بەرەو پیرمان هاتن و بە رووخۆشی یەوە وەریان گرتین. دڵی ئەم بەرواڵەت نەخۆشانە مەکۆی خۆشەویستی بوو . ماڵەکانیان بریتی بوو لە شەش دەست خانووبەرە کە ۱۴ماڵ و ۳۸ کەسی تێدا دەژیا پاش وت ووێژێکی کورت بەرەو ماڵەکان رۆیشتین دیواری خانوەکان لە حاڵی رووخاندا بوو. دیوی ژووری خانووبەرەکان سەرەڕای ئەوە کەلە خشتی سوور بوو ، بەڵام شێوەی لادێی هەر پێوە دیار بوو. دوو وەتاغی بچووکی بوو کە لە سووچی یەکیاندا ئارلە سەر یەک هەڵچندرا بوو،لەگۆشەی ئەوی تردا پەرامێزە کۆنێک و هێندێک ئاوردوو و سێچوار لێفە شڕەی پینەکراوی لێبوو.

بەڵێ ئەوە هەموو کەل و پەلی ژیانی ماڵە گولێک بوو. لە نێویان دانیشتین دەردی دڵیان دەست پێ کرد . پیرێژنێک گوتی : کوڕەکەم لەشارە،دووی رەهنمایی دەخوێنێ ، بەڵام پوولم نیە بۆی بەرێ بکەم. پرسیم : داپیرە مانگێ چەندت دەدەنێ ؟ گوتی: نزیک بە هەشتسەد تمەن. ژنێکی تر کە خۆشی گول و نانکەری ئەوان بوو باسی دەستکورتی و نەداری خۆی کرد وگوتی هەزار تمەن کوا بەشی پێداویستی ژیانمان دەکا ؟ یەکی دیکە گوتی : کوڕەکەم دەبێ لەشار بخوێنێ ، بەڵام پوولمان نیە دیوێکی بۆ بەکرێ بگرین . منداڵێکی ئیفلیجم دی لەسەر کورسی یەکی چەرخداردا نیشتبوو دایکی دەپاراوە چارەیەک بۆو منداڵە بدۆزینەوە. لە وەڵامدا بەرپرسی ئیدارەی بێهزیستی گوتی : پێم وانیە بتوانین کارێکی بۆ بکەین .

هەموو لە دەورەی ئاغای شوجاعی بەرپرسی ناوەندی بەرگری لە گولی شاری مەهاباد کۆبببوونەوە . ئاغای شوجاعی لەمێژ ساڵە ئام وشۆی گولان دەکا و پووڵ و شتومەکی پێویستیان بۆ دەبا .ئێستاش لە فکری قیلەتاوکردنی سەربان و سازکردنی حەمامەکەیاندا یە .بەتێکرایی داوای ئاوردووی زستان و

لیباسیان لێ دەکرد ئەویش بەهێمنی بەڵێنی دەدانێ .
منداڵەکانیان ساغ وسەلیم لەگەڵ دایک و باب یان دەژین، یەکێک لە هاورێکان لێی پرسیم : بڵێی ئەومنداڵانەش بیگرنەوە ؟ لە وەڵامدا گوتم : زوربەی گەورەکان بە هۆی داو دەرمان چاک بوونەتەوە . دیارە منداڵەکانیش واکسینە کراون .
بڕیارمان دا هەرکە گەیشتینەوە مەهاباد کۆمەڵی لایەنگری لە گولان لە پیاوەخێر خواز و بەدڵ و دەروونەکانی شارەکەمان پێک بێنین.
گولان تەنیا بەوپوولەدەژین کە لە لایەن " مەرکەزی موبارەزە با جوزام "ی مەهابادەوە بۆیان بڕاوەتەوە . کۆمیتەی ئیمدادیش بەشێک لەخواردەمەنی و لیباسیان بۆدەنێرێ.
پێویستە بگوترێ ئاوایی سەرچنار بەڕێ یەکی لادێیی لەسەرچناری گولان جوێدەبێتەوە و ئەم رێگایە ئیسفالت نەکراوە .یەکێک لەویستەکانی دێی گولان ئەوەیە کەجادەیان بۆ ئیسفالت بکرێ .بەڵێنی یان دەدەینێ ئەو داوایە بە بەرپرسانی جەهادی سازندەگی رابگەیەنین .
بەکۆڵێک داخ وحەسرەتەوە ماڵ ئاواییان لێ دەکەین .
بەو هیوایە جارێکی تر بە دەستێکی پڕەوەبگەڕێینەوە لایان . ئەوجار بەرەوگوندی " سیاقۆڵ" وەڕێ دەکەوین تا بزانین لەوێ چ باسە .
گوندی "سیاقۆڵ " ڕێ گولانێکی دیکەی ناوچەیە کەلە نێوان سەردەشت و مەهاباددە هەڵکەوتووە .
پێنج دەستە خانووبەرەیە کە ٩ماڵ و ٣١ کەسی تێدا دەژی . بۆ گوندی سیاقۆڵ حەمام و نانەوەخانەدروست کراوە .
و غەربی ، چین ، نیجریا و کۆنگۆ . هەروەهالە ئامریکای جنووبی ، هیندو ، پاکستان و ئەفریقای رۆژهەڵاتدا بڵاو بۆتەوە .
بە گوێرەی لێکۆڵینەوە و تەحقیقاتی کارناسان ، هەموو جۆرە گولییەک لەولاتی ئێمەدا هەیە کە زۆربەیان "موسرین". تەمەنی گرتنەوەی نەخۆشی لە یەک ساڵەرا تا حەفتاوپێنج

" بەسری

دێ گولانێکی‌تر بەناوی "بەسری " لە ناوچەداهەیە کە ٥٢ کەس و لە ١٢ دەستە خانووبەرەدا دەژین .ئەوان جگە لە حەمام فێرگەشیان هەیە . بەڵام ئەوانیش دەردی دڵیان زۆرە . دێ گولان جێی ئەوانەیە کە بەهۆی نەخوشی دوور ئاوایی کراون .

### گولی (جذام)

گولی یەکێک لەنەخۆشییەکانی ولاتە کە لەنێوخەڵکدا " خۆرە "ی پێ دەڵێن .
ئەو نەخۆشییە لە میسر ،هیندو ولاتانی ئەفریقای مەرکەزی
ساڵەیە . بەڵام زۆرتر لە نێوان ١٤ تا ٢٤ ساڵدا دەبیندرێ . نەخۆشی گولی زۆرتر لە لادێ دەبێ.بە هۆی هاتن و کۆچی دیهاتی یەکان بۆ شار و ئاڵ و گۆڕ ،بە تایبەتی موهاجیرەتی خەڵکی دەرەوەی ولات کە زۆربەیان لە ولاتانی گیرۆدەی نەخوشییەوە هاتوون ، ئەوئازارە گەیشتۆتە شارەگەورەکانیش لە گوندەکانی ولاتی ئێمەدا لەبەر نەبوونی ئیمکاناتی بیهداشتی و پاک و خاوێنی فەردی وکۆمەلایەتی ، نەبوونی

خانووبەرەی باش و حەمام ، رەچاو نەکردنی بێهداشتی لەش رێ بۆ گیرۆدە بوون گەلێک ئاوەڵایە .

لەلایەکیترەوە نەخۆشی یە. چلکی وئەنگەلی وپێستییەکان و هەروەها پشت گوێ خستنی بەربەرەکانی لەگەڵ نەخۆشییە ناسراوەکان و نەبوونی بەرنامە ـ یەکی بەربلاو وهەموولایەنە بۆدۆزینەوەی نەخۆشیش دەبنە هۆی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی.

ئەگەر کوو نەخۆش لەسەریەک و بۆ ماوەی خۆدەرمان بەکار نەیەنی پاش ماوەیەک نیشانە ـ کانی نەخۆشی پتر خۆ دەنوێنن و پیاو تووشی نارەحەتی و ئازار دەکەن .

**شوێنەوارەکانی پاش نەخۆشی**

لە تایبەتییەکانی نەخۆشی گولی لەئێراندا ئەوەیەکە ئاسەواری خراپی لێ بەجێ دەمێنێ. گولی لە مەڵبەندە ساردەکانی ئێراندا وەک نەخۆشی دەمار ( بیماری عصبی )خۆ دەنوێنێ . بەگشتی نارەحەتی عەسەبی وەک ئیفلیج بوونی ئەندام، وبەتایبە ـ تی چاوئێشە لە ئێراندا دەبینرێ .

گولی بەهۆی "میکۆباکتریۆم لیپرە" ( باسیلی هانسێن )بڵاو دەبێتەوە . ئەوانەی لە مەڵبەندێکی خاوێنرا بۆ جێگایەکی باسیلاوی بڕۆن دەیگرنەوە . هەرئەونەخۆشانە لە کاتی گەڕانەوەدا دەبنە هۆی بڵاوکردنەوەی نەخۆشی لە ماڵێ نێو خۆیان وبێتوو بەرگری لێ نەکرێ خەڵکێکی زۆر تووشی دەبن .

باسیل لە رێگای پێست و هەموو موخاتێکی داڕووشاوی لەشەوە وەدەر دەکەوێ. چونکوو موخاتی کەپۆ ئەوەڵین جێیەکە کە نەخۆشی دەیگرێتەوە ،بۆیە موخاتی دەموزار ،کەپۆوگەروو کەپڕن لە باسیل رێگای ئەسڵی دەرچوونی باسیل لەلەشن .

باسیل بە نێو پێستی داڕووشاوی وەک : "برین" "شوێنی دەرزی لێدان" "داـ ڕووشان بەهۆی خوراندن"،"خاڵ کوتان"و...وەدێتە نێولەش.

لەبابەت هۆیەکانی یارمەتی دەری نەخۆشییەوە دەبێ بگوترێ هەرچەند لە بڵاوبوونەوەی باسیلی گوایدا دوو عامیلی " **هێرشی باسیل**" و " **هێزی بەرگری لەش**" تەئسیریان هەیە بەڵام رەنگبی عەوامیلی بیۆلۆژ ـ ێکی بتوانن وەزعەکە بگۆڕن .

ئەو کەسانەی لە تەمەنی منداڵییەوە بکەونە بەر پەلاماری باسیلی نەخۆشی گولی زووتر تووش دەبن ، لەووڵاتانەدا کە ئەم نەخۆشی یەی تێدا هەیە منداڵ دەیگرێ و گەورەش دەیگرێتەوە .

هۆ گەلێکی دیکەی یارمەتی دەر، عەوامیلی کۆمەڵایەتین وەک زۆربوونی ئەندامانی خاو خێزان ، نەبوونی شتومەکی پێویست ، نەبوونی بێهداشت و خانووبەرە .

زۆرتر ئەوانە گیرۆدەی گولی دەبن کە گوێ نادەنە پاک و خاوێنی لیباس و جێ خەوتنیان . یا بە هۆی دەست کورتی و نەدارییەوە بۆیان نالوێ . ئەوەی کە سەلماوە ئەوەیە کە دابین بوونی ژیان بە ئیمکاناتی بێهداشتی بە تایبەتی بێهداشتی کۆمەڵ و فێرکردنی گشتی بیهداشت دەبێتە هۆی بەرگری هەموو لایەنە و بنەبڕکردنی ئەم نەخۆشی یە .

**بەرگری**

باشترین رێگەی بەرگری لە

گولی بەگوێرەی ئەوشتانــــەی باسیان کرا ناسین ودیتنەوەی نەخۆش و جوێ کردنەوەیان لــە خەڵکی دیکەیــە . پێویستــــە چلۆنایەتی گرتنەوەی نەخۆشی- یەکە بزانین .

**الف :** گرتنەوەی راستەوخۆ لە مرۆ بەهۆی تف ، چڵــم ، بەڵغەم و برین .

**ب :** گرتنەوەی ناڕاستەوخۆ بە هۆی جلک وهەرشتێکـــــــی باسیلاوی بێ .

کەوابوو باشترین رێگـەی بەرگری بریتی‌یە لە :کەم‌کردنەوەی ئام و شۆی ساغ و نەساغ . بۆ دابین کردنی ئەم گرینگەدەبێ چەند خاڵی ژێرەوە لەبەرچاو بگیرێ .

- ناسینی گول
- دەرمانی نەخۆش

لەو ولاتانە کە گولی هەیــە چون منداڵەکان زووتر لـــە گەورە سالان دەیگرنەوەدەبــێ زۆرتر چاوە دێریان لێ بکرێ تا هێزی بەرگری لەشیان پتــر بێ .

رێگای‌بەربەرکانی دژ بــە نەخۆشی گولی لەئەسلـــــدا بەرگری لە نەخۆش بوونە و ئەوانەن :

- دۆزینەوەی نــــە خۆش ( ئەوانەی کەتازە گیـــرۆدە بوون )
- داودەرمان
- کۆنترۆڵی ئەو نەخۆشانە کەلەژێرچاوە دێری دان .
- چاوەدێری و بەرگـــری لەپەیوەندی .

بۆ دۆزینەوە وناسینــــی نەخۆشەکان دەبێ هەموو خەڵکی ناوچە و دێهات موعایەنــــەی پێستی بکرێن . هەر وەک ئەزموون سەلماندوویەتـــی موعایەنەی ٨٠% ی خەڵکیـــش بەس نیــــە .

- موعایەنەی گشتـــــــی قوتابیانی ناوچەی باسیلاوی . ئەم کارە بێتوولە سەریــەک و دوابەدوا درێژەی پی بدرێ دەبێتە هۆی ناسینی نەخۆشە - کان لە سەرەتای نەخۆشی‌یانەوە و دەکرێ زووتر دەرمان بکرێن.
- لێکۆڵینەوەو پرسلــــە دەور وبەری ئەوانەی تـــازە تووشی نەخۆشی بوون . و موعایەنەی بنەماڵەوهاوسێکانی. بەگشتی ئەوانەی پەیوەندی- یان دەگەڵ نەخۆش هەیە .
- بنۆسەکانی نەخۆشی
- لەکاتی نەخۆش دۆزینەوە دا دەبێ بەرنامەیەکی باشی بێهداشتی بەتایبەتی لــــە گوندەکان بلاو بکرێتەوە .

چون دێ گولان لەناوچـەدا بلاون و هەموولە سەریەک نین ئیمکاناتی یارمەتی گەیاندن و "واحیدی خەدەماتی " وەک: نانەواخانە ، قوتابخانــــە ، حەمام ، دەرمانگا و....گەلێک دژوارە . بۆ لە نێو بردنـــی ئەم کۆسپە دەبێ شارۆچکەیەک دروست بکرێ تا ٣٣٥ گولـــی ناوچەی تێدا نیشتەجێ بن . ئەگەر بۆ مەسئوولان نەلــوێ باشتر وایە لەزەوی یەکانــی دەوروبەری"سەرچناری گولان " بۆ کۆ کردنەوەی ئەم‌نەخۆشانە کەلک وەربگیرێ .

مەسەلەیەکی گرینگ‌تر پێک هاتنی کۆمەڵی لایەنگیری لــە گولانە ، کە پێشتر باسی کرا. دەبێ کە هەموو خێر خواز و ئینساندۆستێک بەپێی هێز و توانا یارمەتی ئەو چــارە- رەشانە بدا . دیارە نەک‌هەر خەڵکی مەهاباد بەڵکوو هەموو خەڵکی خێر خوازی کوردستـــان لە : فەرهەنگی ، کارمەنــد ، بازاڕی و ... بۆ یارمەتـــی گەیاندن بەو لێقەوماوانــە ئامادەن .

دوایین پێشنیار ئەوەیە کە کار و باری بەرهەم هێنان و کار بەوانە بسپێرن وەک : ئاژەڵداری و ...تا بتوانــن بژیوێک بۆ خۆیان وەدەســـت بێنن و نەبنە سەرباری‌کۆمەڵ. خەڵکی بەشەزەفی ناوچــــە دەتوانن لە بەڕێوەبردنی کار و باری سەر بەو ناوچەیە وەک دروست‌کردنی شارۆچکــــە ، نانەواخانە ، فێرگە ، حەمام دەرمانگا و بەشەکانی دیکــە هەر چەشنە یارمەتی یەکیــانْ لە دەست‌دێ بۆ " انجمـــن حمایت‌از جذامیان "ی بنێرن. خودا جەزای بەخێریان‌بداتەوە ورووسووری دنیا و قیامــەت بــن .

## شەب و رووز

«مەلای جزیری»

تودزانی بخودێ من تو خیالی شەب و رووز
بخیالا خوە مەدام من تو ل بالی شەب و رووز

هەر ب میزان دڕەشینی جەگەرێ تیر و خەدەنگ
ژنەسەق ساعیقە مەژ قەوسێ هیلالی شەب و رووز

میسلی گۆیین تە رەوان نال ژ دلێ مسکین تێن
ئەم نزانین تو چرا هەروە دنالی شەب و رووز

تەب فەریاد و فغانان بخوە بولبول کەڕکرد
الله الله ژچ دەردێ وە دکالی شەب و رووز

داکوو دلبەر قەدەمێ لێ بنەهەد رەوشەن کەت
لەوتوو خوونێ وە ژ چەهڤان ڤەدمالی شەب و رووز

تەتنێ زەوق و سەفا کرب سەیێن دلبەرەرا
سەرنخوون گەه شوبی نوونگەه وەکوو دالی شەب و رووز

فتوەیا پیری "مەلا" یان توب ئیلهامێ نەبی
ڤێ مەیێ هەر وەدنۆشی ب حلالی شەب و رووز

پەریشانم پەریشانم ولّم کە
دوچار دەرد پنهانم ،ولّم کە

وەدەردم ئاشنا کردی نەکردی
ستەمگەر فکر دەرمانم ، ولّم کە

ولّمکەتا نەوەیت کەس پەی وەدەردم
دووسێ رۆژێ کە مهمانم ولّم کە

نەگرت کەس دەعوەتم خوەم بیمە مهمان
وەکارخوەم پەشیمانم ولّم کە

نەساخت من وەفوولادە نەوە سەنگ
هەف هەشت دەتیکە سوقانم ولّم کە

تەنم زانم نەسیبی موورو مارە
نە موورم نە سولەیمانم ولّم کە

وەواویلای دلّ هەر شەو رەوانە
سرشک غەم وەدامانم ولّم کە

گوزەشت فەسلّ بەهارو موسم باغ
وەفکر لەرز زمسانم ، ولّم کە

لەوەترسم بکیشد کار وەهاوار
نەکەی کەس گوش وەئەفغانم ولّم کە

وەکام دوشمەن بووەم ئەی دووس شکایەت
کە دووس بی قاتلّ گیانم ولّم کە

ولّم کەولّ کەرت نیم سوب لە مەحشەر
تو کردی خار دەورانم ولّم کە

تۆ کردی بێ سەروسامانی " شامی "
وەمەولا خوەم قەشەنگ زانم ولّم کە

# تەم ڕەوێن «حەقیقی»

کورتە چیرۆکی بەسەرهاتی ژیان
چاری ناکا دەفتەری حەفتا مەنی

من گوتم حەوسەدمەنی پێ رادەگا
ئەوسەری لێ راوەشاندم پێکەنی

بەرهەمت چی بێ لەشیناوەردیژین
کاتی شین بابردەڵەیبەرباوشەنی

ویشکەڵیتا وسووتەشەمچێکی بەسە
کۆنە کۆخێکی بەچرپیمان تەنی

لای من وتۆرا یجەدنیا ،دەنا ....
رایجێکی نایەنێ دنیای دەنی

غەیری مەڵبەندیژیانم چونکەئەو
وەک بەهەشتەدەشت وکێووبەندەنی

تحتها الانها رەجۆبار وچەمی
رەوزەیی رزوانە باغ وچیمەنی

کاتی خەرمانی گوڵانی کێو وکەژ
بەرز و نزموشیوودۆڵ وچرگەنی

نەخشی بێ پرگاریسەرسینەیزەوین
موستەقیم وموستەتیل ومونحەنی

وردەئەڵماسی پریشکی قەڵپەزەی
ئاوی هەڵدێران کەژی کردن خەنی

سوورەڵەمەستوورەیە باغیئیرەم
کواخەوەرنەقکۆخیئەفگەنئەفگەنی

ئەی گوڵی ئاواتمئەیسروەیئومێد
بۆنی تۆدێ بۆیەبولبول ڕاچەنی

گەرچی نەوبووکی بەهارینیشتمان
دڵ رفێنەبەژن وبالاو دیمەنی

تۆیلەسەرچاویخەوالێوتەمرەوێن
تۆلەقوولایی دڵن خەمهەڵ کەنی

خەمرەوێنی گیانەکەمزووزووەرە
واحەقیقی چاوەڕێتە ئەزبەنی!

لە پاداشی قسەی سەردا هەمە ئاه و هەناسەی گەرم
کەسی شێتانە بەردم تێ گرێ من بەرقی ئێ دەگرم
( مەحوی )

تۆ لە ئەووەڵ گۆی وەفات هێنایە ناو مەیدانەوە
ئێستە چەوگانی خیلافت پشتی سەد وەعدەی شکاند
( حەریق )

# زستان «پیرەمێرد»

بەیانی بوو لە خەو هەستام کەروانیم بەفرە باریوە
سلێمانی ئەلێی بەلقیسە تارای زیوی پۆشیوە
دەمێک بوو چاوەڕێی بەفرێکی وابووم موژدە بێ باری
سەرم بەفرە ،کەچی هێشتا شەڕە تۆپەڵمە بۆ یاری
لە بیرمە شێرەبەفرینەم ئەکرد سواری دەبووم بێ زین
نسێ بوو جێگەکەی ئەیبەست ئەما تاکوو دەمی هاوین
بە بەرگی سپیەوە چەند شۆخە شاخی گۆیژە ببینە
لە رەنگی ئاسمان دلبەرترە ئەو سپیە ، ئەم شینە
هەموو پێچەکلووی بەفرێک فریشتەی خوای لە گەڵدایە
فریشتە کەوتە ناومان بۆیەوا ئاشووب و هەڵدایە
ئەوا ساماڵی کرد ،رۆژ کەوتە سەر شاخی (گلەزەردە)
بەسەر ئەو بەفرەدا تیشکی هەتاو ئەڵماسی خواکەردە
بەسەر گۆنای سپیدا خشڵی زێڕینە بریسکەی دێ
پەری سەر کێوی قافیش هێندە پرچی زەردی خۆی لێ دێ
لەسەرسەربان بەفر توێژالێ بەست ، وێنەی چۆڕی شیرە
قەتارەی سەر لق و پۆپی درەختان چەندە دلگیرە
چلوورەی گوێسەوانە پلپلەی زیوی کچە کوردە
سەهۆڵ ئاوێنەیە ، لێکدانەوەی ئەم دووشتەوردە
کە پیرێژن سەروپۆیلەی بە شینی چللە تێک ئالا
بەهاردێ ،داری پیر ئەژیێتەوە دێتە قەد و بالا

گەلێکم رۆژگاری تاڵ و شیرین ڕابوارد ئاخۆ
مەرگ مەودا دەدا دیسان ببینم سەردەمێکی تر
ئەوەندە دەردەدار و بێ پەرستارم کە پێم وایە
لەسەر کێکی تەمەن هەڵناکرێ دیسان شەمێکی تر
( هێمن )

# حیساباتی ئاخری سالّ

«مەحموودی شکاک نێژاد»

سالّی‌سالاّن ، ئەو دەم کە هێشتا شارستانیەتی نوێ و بەرهەمەکانی لە نێوماندا پەرەیان نەگرتبوو، ئەودەمەی کە هێشتا پیرەلامپا و چراگەرچەک لەسەر کورسی و تاقەی مالاّن وەک جحێلّی سمێلّ قنجی پێچ و کلاّو قیتی بە هەوا خۆیان نیشان دەداو بەناز گریان لێ بەرز دەبۆوە ، وەک ئەورِۆ هەموو شتێک بە هەرِەمە نەبوو. هەموو شتێک بەسالّ و بە مانگ بوو.بلّێی لەبیرمان چووبێتەوە سالّێ جارێک قاورمە ساز دەکرا ،سالّێ چەند جاران پلاّومان دەخوارد، و سالّێ جارێک بەرگمان نوێ دەکردەوە؟ بەلّێ هەموو شتێک بە سالّ و بە مانگ بوو.

شارستانیەتی ئەودەم و ژیانی ئەو- سامان بەکاوەخۆ بوو. هەرچی هەمانبوو کۆمان دەکردەوە و بۆ وەعدەی خۆیمان رادەگرت. بەهار و هاوین وپایز کارمان دەکرد. دەچەوساینەوە، هەتا زمهەرِی زستانێ داخەین. بەلاّم داخەکەم زۆر سالاّن تێ دەشکاین و نەدامەتیمان بەسەر دادەهات، و ئاخر مانگی سالّ واتە رەشەمە کە بە مانگی .... هەلّکرِێنە بەناوبانگ بوو دەکەوتینە قەرزان و زارە خوارەمان لەبەر خزم و دراوسێ و ئەقرەبایان دەکرد.خودا بەوێ رۆژێ نەکا و نەیان بیننەوە ،هەرچەند زۆر جاران ناچار دەبین بلّێین " هەر ئەو سالّ خۆزگەم بە پار". ئەگەر ئەورِۆ کار لە سانیەش تێپەرِیوە و هەر ئەو سانیە دەکەنە چەندسەد و چەند هەزار بەش و کاری تێدا دەکەن سالّی سالاّن وانەبوو،پتر حیساب رۆژ - حەوتوو - مانگ- ٣ مانگ و سالّ بوو. پتری حیسابەکان ٣ مانگ ٣ مانگ دەکران،کە ئەورِۆش زۆرکەس هەن رۆژ ژمێرەکەیان لەسەر ٣ مانگ ٣ مانگە .

بەلاّم ئەگەر ٣ وەرزی سالّ بەکاوەخۆ کەوتبانە بەر سەرنج، ساردی و سەغلّەتی سێ مانگەی زستان وانەبوو و هەر رۆژ و حەوتوو و مانگێکی بە وردی دەکەوتنە بەر سەرنج و حیسابیان لەسەر دەکرا ،بەتایبەتی ئاخر مانگی سالّ کە بە مانگی(.....هەلّکرِێنە) و رەشەمە بەناوبانگە .

لەو مانگەدا کەم وابووە بەتایبەتی دێ نشینێک هەموو بەیانان خۆی نەپێچابێتەوە و لە گزینگی بەیانی وزەردەی سەرانی نەرِوانیبێ و جغزێکی لەسەر دیوار نەکێشابێتەوە. هەر ئەو جغز کێشانە خۆی زنجیرە حیساباتێکی پێک هێناوە کە بە حیساباتی ئاخری سالّێ بەناوبانگە و هەرکە ١٨ رۆژی لە ئاخرمانگی زستان دەما دەستی پێ دەکرا .

ئەمن بە بەشی خۆم تاق و لۆق ئەوئی ناوچەی مەهابادە و رەنگە لە جێگای دیکە وا نەبێ.

(سروە)

سروە داوا لە هەموو هاونیشتمانان دەکا هەرکەس حیساباتی ئاخری سالّی ناوچەی خۆیمان بۆ بنووسی ، چونکوو ئەم حیساباتە

حیسابانەم لە پیر و بە ساڵدا چووەکان بیستبوو و حەزم کرد بەر لەوەی یەکجاری لەبیر بچنەوە بیانهێنمە سەر کاغەز و بیان نووسمەوە و بیانخەمە بەرچاوی خوێنەران . بەڵام رووم لە زۆر کەسان نا و تکام لە زۆران کرد چەند کەسێک بزەیان هاتێ و خۆیان لێ بواردم و چەند کەسێکیش بە رووی گەشەوە هەرچی زانییان پێیان کوتم کە ئەوا لێرەدا سپاسی هەر دووک لایان دەکەم .

بەڵام تۆ خوا ، با ئەو ناسۆرەشم لە دڵدا نەمێنێ و وەدەری خەم . " هەروەک پیرەهێمن زۆرجاران کوتوویەتی " هەلێکە و هەڵکەوتووە حەیفە لە دەستی بدەین" ، وەرن نووسەران شاعیران، چازانان ، برایان و خوشکان قۆڵی هیممەت هەڵماڵین، هەرچی لە دەستمان دێ ئەو هەلە باشە بە دەرفەت بزانین و بیکەین و دوایە بەردی پەشیمانی لە چۆکمان نەدەین رەنگە بۆ زۆرکەسان گرینگ نەبێ کە ساڵی ساڵان باب و باپیرانمان هەر کە لە گەلەک دەهاتەوە دەیانکوت " ئەوە ١٨رۆژی زستان ماوە" بەڵام ئەوەش بزانین چاکە کە هەر ئەو مەسەلەیە بۆ رۆژێک کە کوڕی کوردی رەنگە سەر لە عاسمانان وەدەرنێ ئەو"رۆژئەژمێرە" بکاتە بناخەی ئاگاداریەکانی و لە هۆیەکانی ئەو ئاکارەی مام لەگەلەگی بکۆڵێتەوە و بیکاتە چرای رێگای خۆی.

با کورتی ببڕمەوە لە رابردوودا کە زۆریش دوور نیە نیشانەی زۆر هەبوون کە ژیانی کپ و تاریکی کوردی ئەودەمی رووناک دەکردەوە و هیوای پاشەرۆژێکی گەشەداری دەدانێ ئەمنیش ئەوا لێرەدا هەرچی وەگیرم کەوتووە دەینووسمەوە .بەو هیوایەی خوشک و براکانم وەدوای کەون و تەواوی بکەن ، یا بە هەرجۆرێک بۆیان دەلوێ بۆمی بنێرن هەتا دیسان بیانووسمەوە و سەروەی خۆشەویستیش لە چاپیان بدا . انشاءالله .

هەژدە رۆژ بمێنێ بۆ بەهار پێی دەڵێن : **سێ شەش یا سێشەشەی هەیاسی ، شەشیان ناخۆشە ، شەشیان خۆشە ، شەشیان خۆش و ناخۆشە .**

هەر بەو ١٨ رۆژەی دەڵێن: **بیستەکەی گۆرانی، ئەگەر نەبارێ لە قوڵتەی رانی ، گۆران چ لەچی نازانی .**

هەروا دەڵێن هەژدە رۆژی زستان بمێنێ **" بای وەعدە دەلووجەی دێ".**

دەڵێن هەرکە هەژدە رۆژی زستان ما لەگ لەگ دێتەوە و لەوبارەدا نووسراویش هەیە و خوێنەران دەتوانن لاپەڕەکانی" شاری

وێران" لە شوێنەوارەکانی کاک عەلی ـ حەسەنیانی هەڵدەنەوە و بەسەرهاتی لەگ لەگی بخوێننەوە .ئەمن بۆ ئەوەی وتارەکە لە خۆڕا درێژە نەکێشێ واز لە نووسینەوەی دێنم . هەر لەو رۆژەدا دەڵێن : **بزن لەسەر تەنیشتێ ئەستێوی دەخوا** ". دەڵێن ١٢ رۆژی زستان بمێنێ**"حەقە با دێ"** حەقە با ئەو بایەیە کە بەفران دەتوێنێتەوە و رەشانگ ساز دەکا و بەفر خۆی لەبەر راناگرێ و کورد کوتەنی " **چۆرچۆرەی دەکەوێتە بنی". هەر** ئەو حەقە بایە ئەوەندە بە توندی دێ کە دەڵێن سوانان هەڵدەتەکێنێ و بە تەپڵ و دووزەلەوە دێ .**رۆژی ١١ش دزەی دێ** یانی

سەبر و لەسەرە خۆیە. هەر لەو رۆژەدا دەڵێن: **داڵ وەسەررا، با وەبەررا.** لەو رۆژەدا هەروا **وشتری پیرێژنێ وەفاڵ دێ.** حەقدە رۆژی زستان بمێنێ دەڵێن "**بزن لەسەر گلۆپکی رێواسی سەرما بردوویە**" پێنج رۆژی زستان بمێنێ دەڵێن:

**یار بە بۆزێ کیژ بە گواران**
**برمێ ماڵی کاول داران**

لەو بارەوە دەگێڕنەوە کوڕێک تفاقی نامێنێ بیدا بە بارگینەکەی بەڵام ماڵەمامی دەیانبێ کوڕ دەچێ بۆ سەوەتە کایەک هەتا بیدا بە بارگینەکەی. مامی دەڵێ: ئەگەر سەوەتە کات دەوێ، خوشکەکەتم دەیە بۆ کوڕەکەم. کوڕ قینی هەڵدەستێ و دەگەڕێتەوە بە خوشکی دەڵێ: ئەتۆ گوارەکانت بەرە و بچۆ بەو گوارانەت سەوەتە کایەک وەرگرە.

کچ دەچی و دەڵێ: مامە بەو جووتە گوارانە سەوەتەیەکم کا دەیە بۆ بارگینی کاکم. مامی دەڵێ: زێڕم ناوێ مێرد بە کوڕەکەم بکە هەتا کات بدەمێ، کچەش قبووڵی ناکا و دەگەڕێتەوە ماڵێ، ئەوشەوە چ ناکەن بەیانی کە لە خەو راست دەبنەوە، دەبینن تاو و ساوێکی خۆشە و بن داران رەش بۆتەوە و گیا سەری وەدەر ناوە، ئەوجار کچ و کوڕ دەچنە سەربانی ماڵیان وکچ ئەو شیعرەی پێشەوە دەخوێنێتەوە و بەوجۆرەش دەگێڕنەوە کە کچە دەڵێ:

**کوڕ بە بۆزێ کیژ بە گواران**
**رەش بۆتەوە بنی داران**
**برمێ ماڵی کاول وکادێن داران**

دەڵێن ئەو مامە ناوی برایم بووە و دێی برایم خەسار بەناوی وی کراوە، لەبەر ئەوەی کایەکەی خەسار دەبێ وکچ و کوڕەش لە کابرایەک دەبن بەناوی "مووسا" و دوو دێی مووسا و برایم خەسار لە ناوچەی گەورکایەتی بەناوی ئەو دوانە کراوە.

بەردێکی بۆر هەیە لە **دێبوکر** کە دێیەکە لە ١٠-١٢ کیلۆمیتری رۆژئاوای مەهابادا، دەڵێن ساڵ دوازدەی مانگێ تاو لێی نادا هەرکە تاو لێی دا ئەوە هەوەڵی زستانە.

لە دێی **لاسەگولان** (لە ناوچەی یەڵ تەمر) دارێک هەیە پێی دەڵێن "**داری سەیدئەحمەدان**" دوو کۆگا بەردیشی لە تەنیشتە، هەرکە تاو لە کۆما بەردی هەولێی دا، دەڵێن ٣٠ رۆژی لە زستانێ چووە، هەرکە کۆما بەردی دووهەم تاوی وێکەوت، دەڵێن ٢ مانگی لە زستانێ چووە، تاو کە گەیشتە دارەکە دەڵێن هەوەڵی بەهارە.

لە دێی "**گلێنان**"ی ناوچەی (یەڵ تەمری مەنگورایەتی)دا تەپۆڵکێک هەیە پێیدەڵێن (**تەپکی لاسان**) کە قەت بەفری لەسەر نانیشێ ئەگەر هاتوو بەفری لەسەر نیشت هەتا نیوەڕۆیە زیاتر خۆ ناگرێ. ئەگەر ئەو بەفرە خۆی گرت دەڵێن زستانەکەی سەختە.

دەڵێن هەر لەو دێیە گۆمێکی لێیە کە تەنانەت پاشاوەکەشی نایبەستێ ئەگەر هاتووبەستی دەڵێن زستانەکەی سەختە و ماسی دەنێو ئەو پاشاوەیدا گەرمۆکێ دەبەستن کە پێی دەڵێن "**قەڵاغی ماسیان**" ساز بووە. سەهۆڵەکە دەشکێنن و بە تەلیسان ماسییەکان خڕ دەکەنەوە.

لێرەدا بە پێویستی دەزانم لەو برادەرانەش سپاس بکەم لەبەر ئەوەی ئەو قسانەیان بۆ کردووم و منیش راستەوراست نووسیومنەوە: برایان:

**کاک محمدی مینە جهانگیری**: خەڵکی دەرمان محاڵی یەختەچی

**کاک قادری ئاژەند**: خەڵکی سلۆکی ناوچەی مەنگوران

**سۆفی عبداللەرسولی**: خەڵکی کێلێ و بابەکراوائی هەوشینان

**کاک سالحی قەساب (ئەحمەدنەژاد).**

**پاشماوەی مانگازەرد**

ئەمجاریش خێرا چوومەخزمەت شێخ مارفی کوڕی حاجی شێخ حسەین ئەویش نووشتەیەکی بۆ کردو فەرمایشی فەرموو بیکەم بە بەین شاخیا گوێچکەیشی لە دووسێ لاوە کەل کەم . ئەمانەم هەموو بەجێ هاورد ، بەڵام هێشتا هەروەکوو خۆی واسە و خۆش نەبووسەو . دوێکەیش ئاغای مودیر بۆماس سەندن ڕێی کەفتە ماڵ ئێمە کەمانگاکەی بەو حاڵە دی مۆژگاری کردم بێمە خزمەتتان.

ڕوومەتە چرچ و لۆچەکەی نیشانەی دەیان ساڵ ئێش و ئازار و ئەشکەنجەی ڕۆژگاری پێوە دیار بوو. چاوەڕووشەکانی وەکوو هەتاوی وەرزی گەڵاڕێزان تینی لێ بڕابوو ، هەناسە قووڵ و پڕ سۆزەکانی ڕەنگدانەوەی ساڵەها نەداری و دەربەدەری و چەرمەسەری بوون. پێراری ئەهاتەوە بیر کە لەگەڵ شەریفی کوڕی بۆ کرێکاری دەچوونە ئەهواز ، بەڵام پێش ئەوەی لە شیرکەتێکدا بگیرسێنەوە لە قرچەی نیوەڕۆی ڕۆژێکی گەرمی هاویندا شەریف کەوتە ژێر ماشێنێکی باری ولاشەی شەکەتی لەسەر قیرتاوە ڕەش و داخەکەی ئەهواز داپڵیشایەوە و ئەرکی بەڕێوە بردنی سێ کچی هەتیوی بۆ ئەم بەجێ هێشتبوو . لەماڵی دنیاش دوو هۆگان زەوی دێمەکار و مانگایەکی پیری شک دەبرد . سەری هەڵبڕی دڵۆپە فرمێسکێک بە ڕوومەتە چرچ و لاوازەکەیدا هاتە خوار .

دوای چارەکە سەعاتێک گەیشتینە ئاوایی . بەرماڵی کابرا قەرەباڵغ بوو دووسێ کچ بەگریانەوە خۆیان دەڕنی و خەڵکیان لێ کۆ ببۆوە .کە چوومە نێو حەوشە مانگا زەرد بەقەد ڕەشکەکایەک ڕەوابۆوە و چوارپەلی بەرەو ئاسمان ڕەق وەستابوو و نووشتەیەکی سەوزو پان لە نێوان چاوە بە مۆڵەق وێستاوەکانیدا بەدی دەکرا .

---

# داوای لێبووردن

١ ـ لە ژمارەی پێشوودا بەڵێنمان دابوو فەرهەنگۆکی هەر چوارژمارەی "سروە"وەک پاشکۆی چوارەمین ژمارەی گۆوارەکەمان لە چاپ بدەین . بەداخەوە فریا نەکەوتین ئەو بەڵێنییە جێبەجێ بکەین داوای لێبووردنتان لێدەکەین.

٢ ـ "سروە"ی ژمارە سێ لەباری چاپەوە چەند هەڵەی زۆرگەورەی تێدابوو، کەبەم جۆرە ڕاستیان دەکەینەوە .

* یەکەم دێڕی ستوونی دووەمی لاپەڕی پازدە" حەرەکە ئەبێتە هۆی پچڕپچڕ بوونی" دەبوو سی و سێهەمین دێڕی ستوونی یەکەمی ئەو لاپەڕە بوایە .

* لەباسی " ڕاوەتاژی"دا پێنج دێڕی یەکەمی لاپەڕی ٣٥ زیادییە و دەبێ پاک بکرێتەوە .

* لەباسی"چەند تێبینی لەسەر مەولەوی"دا لەو شیعرەی مەولەویدا کە لە ستوونی دووەمی لاپەڕی ٥٨ دا چاپکراوە لەجێگای وشەی" شەوال" بەهەڵە" شەماڵ" نووسراوە .

* لەباسی"ناڵەی‌منداڵ"دا ستوونی دووهەمی لاپەڕی ٩٤ خراپ خراوەتە سەریەک ، دەبێ جێگای ١٩ دێڕی سەرەوە و ١٨ دێڕی خوارەوە بگۆڕدرێ. یانی ١٩ دێڕی سەرەوە بچێتە خوارەوە و ١٨ دێڕی خوارەوە بێتە سەرەوە .

**پاشماوەی سەروتار...**

**قلم**،گفتیم که "مثل آن مثل تیغ است که باغبان با آن خار و خائنان با آن ثار میچینند". همچنین ذکر شد که وسعت،گیرائی، نفوذ و ارزانی زبان قلم موجب گشته تا جمعیت قابل توجهی بدان روی آورده و جمعیتی چندبرابر از ثمراتش بهره گیرند و این خود دلیلی بود تا در کنار تلاشهای مفید و انسانی، دشمنان انسانیت و سودجویان ضدبشر بتحرک افتند و موج عظیم نوشتههای مخرب و ویرانگر را برای نابودی استعدادها ،هنرها و قریحههای سالم و یا انحراف و دربند ـکردنشان براه اندازند. نیز گفتیم که استعمار اندیشه که برای تسلط برجمیع ابعاد زندگی مردم، شرط لازم و بلکه کافی میباشد، هدفی است که سیاستمداران استکبار و الحاد از قلم انتظار تحققش را دارند و در پایان ضمن دعوت از همه آزاداندیشان و اولوالالباب درجهت اقدام به مقابله جدی و بنیانی و بهرهگیری بصلاح از این سلاح، وعده دادیم که حتی المقدور در ابعادی از تعهد قلم به بحث بنشینیم.

**تعهد چیست و چه ویژگیهائی دارد ؟**

تعهد لفظی عربی و از ریشه عهد و بمعنی پیمان پذیری است و متعهد به کسی گویند که پیمانی بسته و البته بدان وفادار باشد، بطوریکه این صفت در او ثابت و مشبه قلمداد گردد. وقتی سخن از تعهد بمیان میآید باید اجزاء بحث روشن شود. برای اینکار باید به این سئوالات که تعهد نسبت به چه کسی است ؟ و عهد کدام است ؟ و چه ویژگیهائی بر آن مترتب است ؟ پاسخ داد.

دراینجا نظر به روشنی موضوع ،درپاسخ دو سئوال اول به مختصر توضیحی اکتفا کرده و سپس به برشماری ویژگیهای تعهد قلم و یا تعهد نسبت به ستمگران و طاغوتیان و خدایان مکر و نیرنگ و زورگویان رنگارنگ منظور نخواهد بود.

**تعهدنسبت به چه کسی است ؟و عهد کدام است ؟**

واضح است که در چهارچوب عقیدهٔ مشترک جامعه و اکثریت قریب باتفاق جمعیت ما (اکراد) ،تعهد در قبال خداوند است و بس. یعنی ما در قبال پروردگارمان متعهدیم و درست بهمین خاطر هیچ قید غیرالهی را پذیرا نخواهیم بود. هرچند ضرورت دارد که لازم و ملزوم بودن تعهدالهی و تعهد غیرالهی را موردبحث واستدلال قرار دهیم. لیکن از آنجا که این یک سوژه صرفا عقیدتی است از طرح آن دراینجا صرفنظر کرده، بلکه بلطف حق درجای خود به رسم تحقیق و بطور کاملا اندیشمندانه به نقد و بررسی کشیده شود.(۱)

روشن است که برنامه عملی منتج از تعهد نسبت به آفریدگار درمحدودهٔ روابط بین فرد و خدا و عبادات و رازونیاز خلاصه نمیشود،بلکه تعهد الهی برای تمامی شئون زندگی بشری برنامه داده و روابط و مناسبات زندگی وی (ازکوچکترین واحداجتماعی تا بزرگترینش) را معین مینماید و درست در همینجا ـست که میتوانیم عهد را مشخص سازیم. عهد ما دراین تعهد حاکم کردن روابط و مناسبات مذکور است، اکنون روشن میشود که چگونه مسئولیت درقبال جامعه و مردم و خلاصه همه چیزازجماد و نبات و.... از تعهد نسبت به پروردگار ناشی میگردد و چگونه متعهد نسبت به خدا، مسئولترین فرد نسبت به یکایک اجزا و جهان آفرینش و بویژه مردم و خلق خداست. باتوجه به آنچه که گفته شد و با عنایت به شناختی کهاز این تعهد و عهد در اذهان خوانندگان عزیز وجود داردبه تشریح ویژگیهای تعهد قلم بعنوان بخشی از مجموعه تعهدات میپردازیم.پیشاپیش این نکته را هم بعرض

برسانیم که این بحث نه‌تنها به قلم بلکه اصولا به تمامی تلاشهای فرهنگی که به شکلی اندیشه، جوهره‌ٔ آن باشد مربوط خواهد بود. از سوی دیگر باید دانست که لازمهٔ حقیقی این بحث ذکر استنادات کافی (با استفاده از آمار و ارقام و نمونه‌های واقعی و تمثیلات مناسب و ......) و ارائه استدلالات متقن و منطقی و موشکافی عام و عمیق است که در این مقوله فرصت و امکانش وجود ندارد و باید به شکل تخصصی تحت عناوین علمی و هنری و .... از سوی صاحبنظران مورد بحث و بررسی و مباحثه و مناظره قرار گیرد و بدیهی است که ماهم بفراخور حال و درخور مقال درمعیت آن دوستان و در مقام تحقیق و تفحص، بوستان علم‌وادب را بتماشا خواهیم نشست (انشاءالله).

**ویژگیهای تعهد قلم و قلم تعهد :**

تعهد قلم و قلم تعهد دو تعبیرند از یک معنی و دو تصویرند از یک مفهوم که در کانونی بهم رسند، تعهد قلم همانست که گر بدست تعهد، قلم سپاری، حاصل آیدوبعبارت ساده‌تر تعهد قلم، تراوش قلم تعهد است، فی‌الحال این قلم متعهد را ویژگیهائی است که در آثارش هویدا باشد و از آن جمله است :

**۱- عدم تخطی از اصول :**

یکی از مسائل اساسی در اینگونه موضوعات که اگر بدرستی تعقیب وپیگیری گردد اصالت و صداقت هر حرکتی را محفوظ نگاه داشته و بالعکس سهل انگاری و بی‌توجهی بدان ضررهای جبران ناپذیری تاحد چرخش ۱۸۰ درجه از مسیر اصلی حرکت را بدنبال دارد، مسئله " عدم تخطی از اصول " است. اصول پذیرفته شده که مبتنی بر نوع تعهد و موضوع آنست باید در جمیع ابعاد که نقش قلم در آن متصور باشد بعنوان محک و معیار ملحوظ گردد، براین اساس **" تحت هیچ شرایطی نباید اصول زیرپا گذارده شده و یا اقدامی بی‌ملاحظهٔ آن معمول گردد و تغییرات زمانی و مکانی هرگز مجوز نقض اصول نخواهد بود "**. هرچند که در مبحث مقتضیات زمان به اثرات تغییرات زمان در آثار قلم خواهیم پرداخت لیکن همینجا بسیار لازم میدانیم که من باب تاکید تصریح شود هر نویسنده که به بهانه‌ای آگاهانه اصول را زیرپا بگذارد متعهد نبوده و به جامعه اهل قلم و مردم بهره‌گیر از آثار قلم خیانت کرده است. **ما منکر تغییر و تحول و دگرگونی در شرائط نیستیم و هم نمگوئیم‌در حرکت قلم بدانها توجه نشود بلکه بسیار هم براین لحاظ اصرار میورزیم، منتها آنچه که باید بدان توجه داشت آنستکه صحیح نیست اصول فدای تغییرات گردد و چهارچوب کار نمیتواند بهاء تغییرات مذکور باشد.** مثلا فرض میکنیم تغییر شرائط زمانی، محیطی، و ... بگونه‌ای است که روش نگارش، عبارات و جملات و موضوعات بحث در گذشته و حال بکلی متفاوت است و وجه سابق مورد پذیرش نیست. دراین صورت آیا حق خواهیم داشت درآنها تجدید نظر بکنیم؟ و شکل جدیدی را برای کار درنظر بگیریم ؟

مسلما حق ما و بلکه وظیفهٔ ما اینست که درجهت تجدیدنظر اقدام لازم را صورت دهیم، لکن باید مواظب بود که این تجدیدنظرها به چهارچوب کلی خدشه‌ای وارد نساخته و در معادلهٔ اصول صدق کند وگرنه تجدیدنظر در روش، اصول را نقض خواهد کردو اگر بپذیریم که برای تجدیدنظر در روشها نقض اصول بلامانع باشد، با فرض ضرورت تجدیدنظر مستمر در روشها و باتوجه به تغییرات آتی شرائط، اصول نیز باید مرتبا نقض گردد. ازطرف دیگر چون نقض

آگاهانهٔ هر اصلی بمعنی نفی آن و پذیرش موقت اصل دیگری است آنگاه باید نتیجه گرفت که اصل ثابتی وجود ندارد تا معیار و محک باشد. اما این نتیجه از یکطرف با فرض اولیه بحث (درمورد تعهد و عهد) سازگاری ندارد و از سوی **دیگر روشن است که در صورت پذیرفتن عدم وجود اصل ثابت و قابل قبول در شرائط مختلف، مجوز برای هرگونه خیانتی به بهانه تغییرات شرائط صادر میگردد، چنانکه در ادامه تا حدودی تبیین شده است.**

قبل از ادامهٔ بحث لازم است توجه خوانندگان عزیز را اشارةً به این نکته جلب کنم که موضوع "**وجود و یا عدم وجود اصل ثابت در جهان**" مقوله‌ای است فلسفی و ریشه در تفکرات و اندیشه‌های فلسفی دارد که علیرغم اهمیت، زیبائی و صلابت بحث ناچاریم از آن صرفنظر کنیم. همینقدر که با عبارات ساده آثار سوء انکار وجود اصول ثابت و صدور مجوز نقض اصول در قبال تغییرات شرائط را دانسته‌ایم برای این گفتار کفایت میکند، مجددا بازمیگردیم باصل مطلب حداقل گروه قابل توجهی از خوانندگان ما با اصطلاحات استراتژی و تاکتیک آشنا هستند، هرچند در زبان ما (چه کردی و چه فارسی) لغت معادلی که بار معنوی آنرا تماما بدوش کشد، نیست لیکن بطور اصطلاحی از استراتژی به اهداف و اصول اولیه و غایت برنامه‌ها و از تاکتیک به شیوه‌های اجرا و عمل و برنامه‌های قطعی و کوتاه مدت که باتوجه بشرائط متغیرند، تعبیر میشود. اکنون ضمن توجه مجدد برابطهٔ استراتژی و تاکتیک بصراحت میتوان گفت که تاکتیک متغیر باید درخدمت استراتژی ثابت باشد. با عنایت به مطالب گفته شده میتوان بطلان اتخاذ تاکتیکهائی که با استراتژی نمیخواند را نتیجه گرفت.

**موید منطقی این مطلب این نکته است که اگر فرد، گروه و یا موسسه‌ای استراتژی خاصی را برای خود تعیین و منظور کرده و سپس درمقام عمل به روشهائی دست زند که با استراتژی تعیین شده متضاد باشد، چه تضمینی وجود دارد تا بصحت ادعای فرد یا گروه یا موسسه مذکور در اختصاص استراتژی اعلام شده بخود، اعتماد کرد؟**

بنظر شما آیا هیچ تضمینی وجود خواهد داشت؟ معلوم است که پاسخ منفی خواهد بود. آیا صدور مجوز برای استفاده از اینگونه تاکتیکها عملا راه را برای فعالیت انسانهای منافق هموار نخواهد کرد تا بهنگام مچ گیری بگویند این حرفم و این کارم تاکتیکی بیش نبوده است؟ و این دقیقا همان حربه‌ای است که همواره مورد استفاده منافقین قرار گرفته است. آیا ادعای دوستی کسانیکه اینگونه می‌اندیشند خوشحال کننده است؟ آیا ممکن نیست دامی بیش نباشد؟

**آیا هدف وسیله را توجیه میکند**

این جمله مشهوری است که در بحثها (نوشته‌ها و صحبتها) بسیار از آن یاد میشود وما اکنون در مقام یافتن پاسخ صحیح این پرسش هستیم. ابتدا مختصرا آنرا توضیح میدهیم و سپس با استفاده از بحث، پاسخ صحیح را انتخاب میکنیم

**مفهوم اینکه هدف وسیله را توجیه میکند اینستکه استفاده از هر وسیله‌ای برای رسیدن به هدف موجه و مباح است، یعنی برای آنکه به هدف برسیم (اصول و استراتژی تحقق یابد) میتوانیم از هر** وسیله‌ای (هر روش و تاکتیکی)

**استفاده کنیم، دراینصورت مجاز است به روشها و تاکتیکهای دست زدکه مخالف ضوابط تعیین شده از سوی اصول بوده و اعمال آنها لاجرم ناقص استراتژی وچهارچوب کلی خواهد بود اینجاست که باید در پاسخ بهسوال فوق گفت که خیر هدف وسیله را توجیه نمی کنند و** وسیله‌هائیکه برای رسیدن بهدف بکار گرفته می‌شوند باید با اصول سازگار باشند وگرنه به بهانهٔ رسیدن بهدف انجام هرگونه جنایت و خیانتی مجاز خواهد بود چنانکه در نزد پیروان آن عقیده چنین نیز هست.

بر این اساس قلم هر نویسندهٔ متعهد از هرگونه تهمت و افتراء، دروغ و کذب، تخریب شخصیت، رواج فساد و تباهی، پوشاندن لباس ارزش برضد ارزشها و بالعکس، کتمان حقایق، کوری ناشی از حب و بغض (در دیدن نقاط مثبت و منفی دشمن و دوست)، بی انصافی و عصبیت کور، خیانت در امانات و دزدی (آثار دیگران)، دستکاری در گفته‌ها و نوشته‌های دیگران (بهنگام نقل مطلب) و .... بدور خواهد بود و این صداقت و درستی تنها درصورت احترام به موضوع" عدم تخطی از اصول" تحقق می‌یابد و إلاّفلا. **"ادامه دارد"**

(۱) ـ لازم است یادآور شویم که ما همچون بعضی دیگر نیستیم که در تغذیهٔ مصنوعی عقیده به مردم، منحرفانه و بیهوده اصرار می‌ورزند تا بدانحد که اعتقادات مخصوص و بیگانه را از اقصی نقاط جهان به عاریه گرفته و سعی دارند ضمیمهٔ فرهنگ این مردم نمایند. غافل از آنکه:

**وصلهٔ ناچسب کی ماند بجا**
**غافلان از هوشیاران کن جدا**

در این موضع توجه به واقعیات موجود و ارزشهای اصیل و خاص شریعت محمدی (ص) جائی برای تحیر و سرگردانی نمی‌گذارد.

کەریمی قەییوومی :

لەپشت پەنجەرەوە تێی دەفکریم هێدی ولەسەرخۆ قەڵەمەکەی لە رەنگەکە وەردەدا ، بە سپایی بەسەر پارچەکەیدا دەگێڕا.

تۆزێک لە تابلۆکە کشاوە . سێرەیەکی دایە وئەوجار قەڵەمەکەی دانا . لەسەر کورسی یەکە هەستا . چاوێکی لە دەوروبەری خۆی کرد ولە وێنەی کەوێک راما.بەدەرفەتم زانی لێی وەژوور کەوتم . سڵاوم کرد .

هەرکە ئاوڕی داوە ومنی چاوپێ کەوت بەگەرمی وڵامی دامەوە . دوای بەخێر هاتنێکی گەرم و گوڕ دەستی بەردام نەمدەزانی لەکوێرا دەست پێ بکەم . بڵێم چی ؟ بڵێم بۆ هاتووم ؟ .

هاتووم هەتاتێر سەیری زەماوەندبکەم ؟ هاتووم هەتا هەست بەسۆز و کوڵی باڵندە ـ کانی یەخسیری نێوچوارچێوە بکەم ؟ هاتووم تا دیمەنی جوانی شار و لادێی وڵاتەکەم ببینمەوە ؟ یا هاتووم تا حەز لە هونەر بکەم ؟ بەڵێ بەدوای هونەر داهاتبووم بەڵام کام هونەر؟ ئایا منیش قەدری هونەرم زانیوە ؟ رێزم بۆ هونەر و هونەرمەند داناوە ؟ یاخۆ هەر ئەوەدەمە لەبیرمەکە لە بەرامبەریدام ؟

تێک رامابووین . ئەو پێی سەیر بوو کەمن بەم هەموو قفڵ و قەرازەوەچم دەوێ؟منیش ئەوەم پێ سەیر بوو کە خاوەنی ئەم هونەرە بۆوا بێ هەوایە .

قەراغم تێک کردنەوە ولە مەبەستەکەم حاڵی بوو .ناو بانگی زۆر لەمەپتر دەرکردووە کەبمەوێ بیناسێنم . ئەدی چی لێ پرسم ؟ بالەزمانی خۆیەوە لە ژیانی ئاگادار بم .

**من مستەفای شێرزادم کوڕی حوسێن لەبنەماڵەی فەیزوڵڵا بەگی بۆکانم . لەساڵی ١٣٢٠ای هەتاوی لەشاری مەهاباد لەدایک بووم . ئێستا رەئیسی ئیدارەی دوخانیاتی بۆکانم .**

ئەوجار دەمەوێ بزانم چ ماوەیەکە خەریکەو هەوڵ

دەدا کەوالە نێوتابلۆکانیدا تواوەتەوە .

- بیری منداڵی تیژە ئەودەم کلاسی ئەووەڵی سەرەتایی بووم زۆرسەیر عەلاقەم بە نەقاشی بوو . ماڵمان لە تەوریز بوو .چەند ماموستای نەقاشی دەستیان گرتم وبوونە رەورەوەی دارە- دارەی‌هونەریم دنەیان دام ، تەشویقیان کردم ، رچەیان بۆ شکاندم .تا لە دەورەی دەبیرستاندا لە موسابەقەی وێنەگەری لە ئوستانی ئازەربایجانی رۆژهەڵاتی و رۆژئاوایی دا بە شداریم کرد و پلەی یەکەمم وەدەست هێنا . وەدەست هێنانی ئەم پلەیەبوو بە هۆی ئەوە کە بمنێرنە ئوردووی رامسەر لەوێش موسابەقە بوو. ئێستاش نەمزانی هۆی چ بوو کە لەم موسابەقەدا سێهەم هاتمەوە . لێم سوور بوو کە هەوەڵین پلە هی منە . بەڵام ئەودەم "ضابطە "یەک نەبوو ، تەنیا "رابطە" بوو مەرجی ناسین وناساندن .

بەڵێ ئەوەی روون وئاشکرایە ئەوەیە کە هونەری نەقاشی پەیوەندی لە گەڵ هونەرەکانی دیکە هەیە .بۆوەی قسەکەم بسەلمێنم دەڵێم

- کاک مستەفا تەنیا لە زەمینەی نەقاشیدا کارت کردووە ؟ یا بابەتەکانی دیکەی هونەریشت تاقی کردۆتەوە ؟

- من هەروەکی لە پێشداگوتم عەلاقەیەکی زۆرم بە نەقاشی هەیە ولە هەموو بابەتە هونەرییەکانی دیکەپتر بە دڵمەوە دەنووسێ . دەنا لە دەورەی دەبیرستاندا لە زەمینەی تئاترکارم کردووە ، گریم ،دکۆراسیۆن ،گۆرانی ، و مووسیقا بەشێکی دیکەی ژیانی هونەری من بوون ،بەڵام هونەری نەقاشی دەورێکی وەهای لە گۆڕانی هەستمدا بوو کە فیکرو زیکری خۆم بۆئەو مەبەستە تەرخان کردووە .

تائێستا چ هەنگاوێکتان بۆفێر بوونی لاوەکانەهەڵگرتووە و چ چاوەڕوانی یەکتان لە بەرپرسانی فێرگەکان هەیە ؟

- من ئێستاش لە حاڵی فێر بوونی نەقاشی دام . دەمەوێ تەکامول پەیدا بکەم . ماوەیەک لە فەرهەنگ و هونەر بووم لەوێ کلاسی نەقاشیمان بوو . ئەوجار کەهاتمەوە بۆکان لێرەش هاوینانکلاسمان هەیە .

بەداخەوە ئێستا لە فێرگەکاندا هیچ هەوڵێک بۆ نەقاشی نەدراوە . منداڵ لە هەوەڵ پلەی خوێندنیدا ئەگەر بێتوو بە قەڵەم و کاغەز تەنیا فێری کێشانی خەتی راست بکرێ دەستی رادێ ،من ناڵێم هەموو ببنەوێنەگەر بەڵام لانی کەم ئەوانەی ئیستعدادی ئەم هونەرەیان هەیە ، ئەو هەستەیان تێدا نەمرێ و بتوانن لەداهاتوودا وەدیووی بکەون .

دەمویست سەبارەت بە هونەری نەقاشی لەجیهاندا رای ئەم هونەرمەندە بزانم لە وبارە شەوە پرسیارم لێکرد .

- ئێمە لە شارێکی بچووک دادەژین . لەنێوخۆماندا هەزار کۆسپی گەورە هەیە کە دەبێتە بەرهەڵستی پێگەیشتن و پەرەگرتنی هونەری نەقاشی.

لەمێژ بووحەزم دەکرد ئەم
تابلۆیانەی عەکسەکەیانم
لێرەولەوێ دیتووە لەنزیکەوە
ببینم هەربۆیەش سەفەرێکی
شەش حەوت مانگەم بۆ ئورووپا
کرد ولەوێ لە ولاتەکانی
ئینگلیستان ، ئالمان،فرانسە
هوڵەند ، بلژیک ،ودانمارک
نمایشگای نەقاشیم چاو
پێ کەوت بەتایبەتی لە
ئامیستردام تابلۆیەکی
نەققاشی رامبراند زۆری شوێن
لەسەر دانام و لێبڕاوی کردم
کەتەواوی ئاسەوارەکانی‌ئەم
هونەرمەندە لەنزیکەوە
ببینم .

هەرواچاوم دەگێڕا هەر
تابلۆیەی جوانی یەکی
تایبەتی هەبوو . هەرکە
قسەکانی تەواو دەبووسەری
هەڵدێنا وچاوی لەتابلۆیەک
دەبڕی کە دیمەنی خاسەکەوێکی
سەربەرد بوو. ئەم روانینە
پرسیارێکی لە مێشکمدا
گەڵاڵە دەکرد .بۆوەی لەم
مەبەستەش حالی بم‌بەشێوەیەک
پرسیارەکەم گەیاند وگوتم :

-هەموو تابلۆکانت
جوانن بەلام کێهەیان پتر
بەدڵتەوە نووساوە ؟.

-پێم سەیرە ! من پێم وانیە
کە تابلۆکانی‌من‌تا ئەورادەیە
دڵگرین . من هەرچی هەستم
نەبزوێنێ خۆی لێ نادەم .
هەموو تابلۆکانم سەرچاوەیان
بیرەوەری تاڵ وشیرینی
دەورانی ژیانی‌خۆمە ،من سێ
کارم زۆربەدڵ بوون ،یەکیان
ئەم کەوەیە (دەستی بۆلای
تابلۆی کەوەکە راداشت ) .

من کەوێکی نێو قەفەسم
کێشاوەتەوە . ماوەی‌چەندشەو
ورۆژ دانیشتووم و ئەوکەوەم
بەرامبەری خۆم دانادە .بڕوام
پێبکە زۆرم سەرنج داوەتێ
جوان سەیری دندووک و باڵ
ولاقی ئەوم کردووە . زۆرم
دەدیت بەزمانی بێزمانی
هاوار دەکا من لەنا و قەفەسی
شوو بێنە دەر .بەلام‌بەداخەوە
من ئەودەسەلاتەم لە خۆمدا
نەدەدی کە بتوانم لە قەفەس
رزگاری بکەم . هەربۆیە تەمام
گرت کە ئەوکەوەبە ئازادی لە
سەر بەردێک ببینم . ئەگەر
نەمتوانی ئازادی بکەم‌توانیم
وێنەکەی ئازادکەم ونەیخەمە
نێو چوارچێوەی تەنگەبەری
رکەوە . لە زۆرجێگا پێشنیاری
فرۆشتنی ئەم تابلۆیەم پێ
کراوە بەلام هەرگیز رازی
نەبووم لەخۆمی دوور کەمەوە
تابلۆی دووهەم ئەوزماوەندەیە
کە لەسروەی ژمارەسێدا چاپ
کراوە .

لەچ سەبکێک داکاردەکەن .

-من کارەکانم زۆرتر لە
سەبکی "امپرسیۆنیسم " دایە.
پێوستی بە دەرفەتێکی‌زۆرهەیە
دەبێ بچی بۆ دەرەوەی شار ،
لە تەبیعەتی ئازاددا ،لە
سەحراو دەشت و دەمەنی
کوردستاندا وێنە هەلگرییەوە
بەلام بە داخەوە فرسەت نیە.

زۆرباشە ئەدی ئێستا چ
کارێکتان بەدەستەوە ؟

-من زۆرم بابەتەکانی
فۆلکلۆری پێ خوشە .دەمەوێ
زیندوویان بکەمەوە . بۆوێنە
قەدیم دەستەیەک هەبوون بە
دەهۆل و زۆرناوە دەگەڕان و
ورچ ومەیموونیان
هەڵدەپەڕاند،دێ بە دێ

دەگەڕان و خەڵکیان سەرگەرم دەکرد . تابلۆی تازەی من ئەوەیە کە دەمەوێ ئەو مەبەستە دیسان بخەمەوە بەرچاو .

دیاربوو ماندووە و،لەکارم کردووە بەڵام لە دانیشتن لەلای ئەم هونەرمەندە تێر نەدەبووم . ویستم ئەمجار بزانم ئەوبەچی دەڵێ هونەر و بەکێ دەڵێ هونەرمەند.

ـهەونەرمەندیواقیعی دەبێ دووشتی گرینگی لەبەرچاوبێ:

یەکەم ئەوە کە :بەخیل نەبێ وئەوەی بۆ خۆی دەیزانی لە ئیختیاری خەڵکیشی بنێ و پێی وانەبێ کەوا باشە هەر ئەو ئەم کارە بزانێ وبەس . ئەم باسە تەنیابۆ نەقاشی نیە و بەڵکوو هەموو بابەتەکانی دیکەی هونەری دەگرێتەوە . چون ئەم کارە نەتەنیا بۆ هونەرمەند زیانی نیە بەڵکوو زۆریشی قازانج هەیە و دەتوانێ پەرە بە کارەکەی خۆی بدا .

دووهەم ئەوەیە کە :هونەر-مەند نابێ لە رەخنە بترسێ. دەبێ کارەکانی خۆی لە بەردەستی خەڵک دابنێ و راونەزەری خاوەنڕایان بزانێ. بەبڕوای من گەورەترین هۆی سەرکەوتنی کەسێک نەترسان لەرەخنەیە .هەڵبەت رەخنەی سازەندە . واتەکەسێک کەدێ چاولەتابلۆیەک دەکا و بەقسەیەک دەڵێ ئەوحاستەی تابلۆکە ناحەزە ئەوە رەخنە نیە بەڵکوو دەبێ ئەوەش بڵێ کە ئاوابێ باشترە . من لە ماوەی ژیانی هونەری خۆمدا ئەو ئەزموونەم وەدەس هێناوە ودەزانمکە ئەگەرمن تائێستا رەخنە لە کارەکانم نەگیرابا نەمدەتوانی تائەورادەیە تەکامول پەیدا بکەم .

بەگشتی پێم وایە هونەرمەند بەرەخنەوە پێدەگا .من ئەگەر ئەسەرەکانی خۆملە قفڵوهاچەرنابا ئێستا هەر ئەوەندەم دەزانی کەبیست ساڵ لەمەوبەر دەمزانی .

خەیاڵ دەبم کەزۆر جارلەبیرم دەچێتەوە وەختی نان وچاو وچان دان هاتووە.ئەم کارە دووهۆیهەیە .

یەکەم:ئەوە کە بتوانم هەستی خۆم نیشان بدەم .

دووهەم :رەنگەکان جوانتر تێکەڵ بکەم . لەسێ رەنگی ئەسڵیکە زەرد وسوور وئابییە ئەوەندە رەنگ سازدەکرێ کە پیاو سەری سوڕ دەمێنێ .

خۆشترینکاتی ژیانم ئەوەیە کە لەتابلۆیەک رادەمێنم و رەنگەکانی بەدڵی خۆم هەڵدەبژێرم .

- ئەو دەمەی خەریکی نەقاشی و دەتەوێ تابلۆ یەک پیادە بکەیچ هەستێکت هەیە ؟

- من ئەودەمەی خەریکی تابلۆیەکی نەقاشیم لەدنیای ماددی هەڵدەبڕێم وهیچ پەیوەندی یەکم لەگەڵ دەرەوە نامێنێ . تارادەیەک نوقمی

پرسیارێکی زۆربێ وەلام مابوونەوە .بەڵام نەهدەویست لەمەپتر ماندووی بکەم . کاس ووڕ لە خزمەتی وەدەرکەوتم وەک زوربەی هونەرمەندان دڵ پڕ لەژان بەڵام پاک و خاوێن وبەدڵ ودەروون بوو .

# ڕێنوێنی

**سەقز :کاک ڕەحیمی لوقمانی**

ڕەخنە وپێشنیارەکانت زۆر بەجێ بوون . خوایاربێ لەبەر چاویان دەگرین .

شیعرەکانی خۆیشت لەگەڵ ئەوەی کەلەباری وشەوکێش و قافیەوە کەم و کووڕی زۆر نەبوو ،بەڵام شەقلی شیعری شاعیرێکی ناسراوی پێوە دیار بوو. بەتایبەتی لەو جێگایەدا کە دەڵێ :

**لەگەڵ زوربەیمنداڵەکان**
**ئەو پێخاوسەژین تاڵەکان**

لەباری زمانیشەوە ئەم عەیبانەی تێدا دەبینرێ : هەر لەم شیعرەدا " ئەوپێخاوسە ژین تاڵەکان "دروست نیە و دروستەکەی "ئەوپێخاوسە ژین تاڵانە"یە بەمەرجێک دەستلە دێڕی یەکەمیشی بدەی تا قافیەکەی تێک نەچێ .

هەروەها لەم شیعرەدا :

**"زۆر ئاوات بوودەیبزوانین**
**کۆشکی هیوای دەڕازانین"**

"دەڕازانین "نادروستە . چونکوو "دەڕازاندینەوە"مان هەیە نەوەک "دەڕازانین" . کەبەلەهجەی شیماڵ یانی کۆشکی هیوای دەخەواندین . بەجێگای "دەیبزوانین"یش باشتر بووبڵێی"دەیبزواندین

ئەڵبەت زەوقی شیعریت زۆر باشەو هیواداریـن درێژە بەکاری خۆت بدەی و لەبەرهەمەکانی دیکەشت بێبەشمان نەکەی .

**بێسارانی سنە :کاک عەدنان زەبیحی**

هەرسێ نامەی ئێوەمان پێ گەیشتووە . زۆرمان پێ خۆش بوو شیعرەکانت بەناوی شاعیرێکی لاوی هەورامان بڵاو بکەینەوە .بەڵام بەداخەوە لەبەر هێندێک کەم و کووڕی نەمانتوانی کەلکیان لێ وەربگرین .بۆ وێنە لەم شیعرە ئاخرییەتدا:

١ ـ هەموودێرەکان قافیەیەکیان هەیە .نەغەزەل وایە ونە مەسنەوی .

٢ ـ شتێکی تازەیان تێدا نیە و لەتەعبیری کۆن وەک " چەرخی چەپگەرد" کەلکت وەرگرتووە .

٣ ـ ئاخری زوربەی شیعرەکان "کەرد"ە کەدەبێ بە ڕەدیف . بەڵام قافیەیان نیە .

کەوابێ داوات لێ دەکەین لە بەشەکانی دیکەدا هاوکاریمان بکە .

**ورمێ :کاک شەریفی دەستە کزەن**

کوردی نووسینەکەت جوانە هیوا دارین لەباتیلەشیعر خەریکی نووسین بی .

**مەهاباد : کاک حوسینی تەلەنگ**

دیارە ئیستیعدادی شاعیریت هەیە . بەڵام لەوشیعرەتدا ناهومێدی زۆر بەدی دەکری . چاوەڕوانی شیعری تازەتر و لەبارتری تۆین .ئاواتی سەرکەوتنت بۆدەخوازین .

**سنە :کاک حامیدی کەریمیان**

شیعرەکەت هەستێکی جوانی تێدایە . بەڵام لەشەش جێگادا وشەی"گرتووە"ت بەقافیە هێناوەتەوە ،کەردەیفە و وشەکانی پێشتریان قافیەنین .بۆوێنە لەم شیعرەدا

**عەسری بەهارە سیبەر چەن**
**جوان سنەی گرتووە**
**خاڵ خاڵی بەفری سپی**
**ئاویەری گرتووە**

"سنەی"و"ئاویەری"قافیەنین .

**بانە: کاک محەممەدی بەرزەخ**

کوردی نووسینەکەت زۆر جوانە . درێژەی پێ بدە و پێت وا نەبێ هەر شیعر ئەدەبیاتە ،دەتوانی لە شیعر و نووسیندا خزمەت بە ئەدەبی کوردی بکەی سەکەوتووبی .

# ئەدەبی

مەهاباد :**خوشکە فەوزیە ق**

ئیستیعدادێکی باشت بۆ شاعیری هەیە .پتر موتالاّ بکە .چاوەڕوانی گەیشتنی شیعرەکانی دیکەشتین .

گوندی کاژێی سەردەشت : **کاک ع.شیواو**

کێش و قافیە و رەدیفی شیعرەکانت تەواوە و ئیستیعدادت باشە .بەلاّم هەولّ بدە بۆ ئیحساسی خۆت شیعر بلّێی .جیاوازی نێوان شیعرو نەزمیش هەر ئەوەیە .

چاوەڕوانی هاوکاری پتری ئێوەین .

بۆکان :**کاک کەمال بێناو**

دیارە زەوقی شیعرت هەیە ئەگەر پتر تێبکۆشی هیوای سەرکەوتنمان بۆت هەیە .

بالکی مەریوان :**کاک عبداللە کەریمی**

یەکەم بەیتی پارچە شیعرەکەت کە دەلێ :

**دەمێ نەبوو لەژێندا سەرلە سەرین کەم بێغەم**
**خۆم لە غەم ئەشاردەوە خانە خوێ بوولە جێگەم**

زۆر جوان بوو ، بەلاّم لە وانی دیکەدا ئەوناسکی یە نابینرێ . ئەگەر پەلە نەکەی شاعیری چاک دەبی . سەرکەوتووبی .

لە کۆتاییدا پێویستە رابگەیەنین شیعر و نووسراوەیەکی زۆری دیکەشمان گەیشتۆتە دەست کە هێشتا نەمانتوانیوە پێیان رابگەین و لەم ژمارەی "سروە"دا بەهرەیان لێ وەربگرین. خوا یار بێ لەمەودوا دەیانخەینە بەر سەرنج و لە ژمارەکانی داهاتوودا هەرکامیان پێویستی بە رێنوێنی بێ رێنوێنی دەکەین .

شیعری ئەم ئازیزانەشمان پێ گەیشتووە کە وێڕای سپاس لەو هەستە جوانەی بەرانبەر بە "سروە" دەریان بڕیوە ، داوایان لێ دەکەین پەیوەندیمان لەگەلّ نەپسێنن و ئەگەر شیعر و بەرهەمی باشتریان هەیە بۆمانی بنێرن ، بەلاّم ئەوەش بزانن کە زوربەیان نووسینێکی جوان و لەبار و پاراویان هەیە و دەتوانن هەرکەسە بەپێی زەوق و زانستی خۆی جگە لە شیعر لە مەیدانەکانی دیکەی ئەدەبی وەکوو پەخشان نووسی، چیرۆک نووسی ، نووسینی مەقالەی زانستی ، تەحقیقی و .... دا سەرکەوتوو بن ، سەرنجیان بۆ ئەم مەبەستە رادەکێشین و سەرکەوتنیان بەئاوات دەخوازین :

مەهاباد :**کاک فەرهادی ئێرانپەنا ،کاک عبداللە لەجێ ، کاک محەممەدی بەهرام بەگی، کاک سەعیدی ئ .**

بۆکان : **کاک کەمالی ئەحمەدی(ناسر) ،کاک قادری خدرزادە ، کاک پ . شێرکۆ عادلّ .**

سەقز : **کاک عەلی یوسف ـ زادە ، کاک مەسعوودی فەتتاحیان، کاک ئ . شەم .**

رەوانسەر : **کاک بەختیاری شەریفی ، کاک ئەکبەری حەسەن زادە .**

سنە : **کاک عەلی ئەکبەری خازە .**

مەریوان :**کاک م.مەلوول .**

ورمی :**کاک رەحیمی ئازادی.**

شنو : **کاک ئەمجەدی خزری.**

جەلدیان :**کاک عوسمانی کانی رەشی .**

شاروچکەی زارعانی خوی : **کاک جەمالی قشووری .**

گوندی کولتەپەی بۆکان: **کاک حەکیمی فەیزی .**

گوندی گردەبنی لاجان:**کاک ئ.رزگار .**

گوندی خوڕخوڕەی شارویرانی مەهاباد: **کاک سەید خدری میر سەییدی.**

گوندی نەلاسی سەردەشت : **کاک عوسمانی سالحی ،**

لە سەر سەکۆی بەتاڵی ئیستادیۆم دانیشتبووم،لە بیر راچوو بووم،هەستی دەستێک رایپەڕاندم ،وەرسوو- ڕامەوەدۆستێکی خۆشەویستم گوتی :

ــ برالە وەرزش لە مەڵبەندی ئێمەدا زۆرمەسەلەی تاقی کردۆتەوە.تۆش لە هە دەرفەتێک دەگەڕای کە قسەکانت بکەی .دەجا رابەو راست ودروست هاوار بکە کە وەرزش لەم مەڵبەندە........

بەڵێ بە راشکاوی و ڕووڕاستانە دەڵێم وەرزش لەم مەڵبەندە بێ بەشی دیوە. گیروگرفتی هەبووەو پێویستی بە فەزایەکی بڵاوترهەیە کە مەسایل وکەم وکوری یەکانی بێنێتە گۆڕ.دەبێ بە وردی لەم گیروگرفتانەبکۆڵدرێتەوە گۆوارە سەرانسەری یەکان ، دەرفەتێکی تەواویان بۆ باس کردن ولێتوێژینەوەی ئەمگیرو گرفتانە نیە.تەنگ وچەڵەمەی وەرزشی لە وڵاتی پان وبەرینی ئێراندا ئەوەندە زۆرە کە گۆوارەسەرانسەری یەکان ناپرژێنە سەر هەموو ناوچەکان .

ئێستاکە گۆوارێکی کوردی لە کوردستاندا بڵاو دەبێتەوە دەرفەتێکی باشە بۆ ئەوەی کەم وکووری یەکان بخەینە روو تا بەڵکوو بۆبنەبرکردنیان ڕێگایەک بدۆزینەوە.

**زۆرەوانی ئێمەو....**

زۆرەوانی سەقزبە بوونی مورەببیانی دڵسۆزی وەک عەبباسی خاکی توانیویەتی جێگایەکی تایبەتی لە وەرزشی ئێراندا بۆ خۆی تەرخان بکا .خاکی لە درێژایی کاری بەرچاوی خۆیدا توانیویەتی شاگردانێکی وەک مرادخانی وسەلیمی پێ- بگەیەنێ وپێشکەش بە کۆمەڵی وەرزشی وڵاتیان بکا ،ئەم دووانە بەوەرگرتنی مەدرەکی نێونەتەوایەتی مورەببیگەری بە نمرەی مومتازەوە شانازی یان بۆ ئەم مەڵبەندە خوڵقاندووە مورادخانی وەک مورەببی یەکی تیمی زۆرەوانی فەرەنگی بۆسەفەری مەجارستان جێگای فەخری وەرزشی بێ بەشی ئەم مەڵبەندەیە ئەوانەش بەبار هێنانی شاگردانی وەک موحەممەدی چەمەن گوڵی خاوەنی پایەی یەکەمی کێشی ٦٢ کیلۆی ساڵی ٦٣و٦٨کیلۆی ساڵی ٦٤ی موسابەقاتی نێونەتەوایەتی ٢٢ی بەهمەنی ئێران وژمارەیەکی زۆر وەرزشکاری بەئەزموون بە ئەخلاقی تر توانیویانەناوبانگی ئەم مەڵبەندە بەرز بکەنەوە دیاری زۆرەوانی یا ملانە لە شارەکانی تری کوردستانیشدا جێ و شوێنی خۆی هەیە.بۆنموونە،سنە بەهادی موخبیری،فەرهادی جەعفەری عەبدوڵڵای ئەلیاسی وشاپووری عەلی یەنا ئەندامی تیمی میللی کرێکارانی ئێران ویەکێک لە خاوەن میداڵە سەرەکی یەکانی سوئێدەوەخۆ دەنوێنێ .دیارە هۆی سەرکەوتنی ئەو وەرزشکارانە پتر نەزم ورێک وپێکی یەکە کە لە کاریاندا وەبەرچاودێ.

**کاسیب نیشانی دا ...**

کاسب بەوەدەست هێنانی پلەی دووهەمی پینگ پۆنگی ئینفرادی ئێران نیشانی دا سەرکەوتنی کەسانێکی وەک، فەریدی فەرەجپووری وجەمیلی (لطف‌اللەنسب) بە هەڵکەوت نەبووە وئەگەر ئیمکاناتی

باشلە کوردستانی ئێراندا ، بۆ وەرزشکارانی ئەم رشتەیە پێک بێ دەتوانن لە داهاتوودا جێگا هومێدێکی باش بن .

**بەسکتباڵی بێ هیزی ئێمە**

بەسکتباڵی بێ هێزی کوردستان زەمانێک زۆر قسەی بۆ کوتن هەبوو بەڵام بەداخەوە ئێستا هێزوتوانای جارانی نەماوە .جابۆ؟ ئەمە پرسیارێکە بۆ هەموو وەرزشدۆستانی بێ وەڵامماوەتەوە .هیوادارین بتوانین لە داهاتوودا بە شێوەیەکی بەربڵاوترلە سەری برۆین .

**جەمیلی تەوانایی و تیمی میللی**

پێویستە یادێکی جەمیلی تەوانایی دەوەندەی بەهێز و نوێنەری ئێران لە رشتەی ٣٠٠٠ میتری بەمانیع بکەین کە ئێستا بەرپرسی تەربیەت بەدەنی کرێکارانی ئوستانە ولە موسابەقەکاندا بەشداری ناکا .بۆ روون کردنەوەی پتری ئەم مەبەستە خوایار بێ لە داهاتوویەکی نزیکدا وت وویژێک لەگەڵ کاک جەمیل وشەهرزادی حەزرەتی لە قوروەوە پێک دێنین و لێرەدا بە کورتە باسی دەو مەیدانی دوایی دێنین .

**لطف اللەنسب وبەهرامی ..**

بەڵام لە لایەکی ترەوە (لطف اللەنسب)و بەهرامی دوو مورەبی فووتباڵی شاری سنە بە ئامادە کردنی تیمێک بۆموسابەقاتی گشتی دەستەی دووهەمی قودس زەحمەتێکی زۆریان کێشا ولە پلەی یەکەمی موسابەقاتدا سەرکەوتن .بەڵام بەداخەوە لەپلەی دووهەمدانەیانتوانی لەم هەلەباشە بۆ چوونە نێو دەستەی یەکەم کەڵک وەربگرن لە ساڵی داهاتوودا کێشەیەکی سەخترتریان لە پێشە چونکوو دووتیمی بەهێزی دەستەی یەکەم هاتوونەتە نێودەستەی دووهەمەوە .

محەممەدی چەمەن گوڵی خاوەنی پلەی یەکەمی ٦٨ کیلۆی زۆرەوانی فەرەنگی ئێران

**داوەرانی بۆکان وهەیئەتی ..**

ماوەیەک بوو ،نەک هەر بۆداوەری ئەوموسابەقانەی کە بە بەشداری تیمێکی میوان بەرپادەکران .بەڵکوو بۆ موسابەقەی نێوخۆیی تیمە بۆکانی یەکانیش داوەری شارەکانی تریان دەهێنا . ئەمەش ببووە هۆی بەخۆدا شکانەوەی داوەرەبۆکانییەکان وبە هێزتربوونی ئەم گومانە کە ئەم داوەرانە دەسەڵاتی بەرێوەبردنی موسابەقەکانیان نیە .بەڵام دوای لاچوونی ناکۆکی نێوان داوەران و هەیئەتی فووتباڵ بە داوەری کردنی چەند موسابەقەیەک نیشانیان داکە لە رادەی باشترین داوەرەکانی ئوستاندان .

**پرسپۆلیس ،کارۆ ........**

تیمگەلی پرسپۆلیس و کارۆی سەقز ماوەیەکە بە یاری رێک وپێک وپشتیوانی هەموو لایەنی لاوان ومێرمنداڵان ودەستەی پاشەکەوت (ذخیرە) دێن فووتباڵی ئەم شارە سەرلە نوێ ببووژێننەوە کە ئەم سەرکەوتنە بەهاوکاری دوو تیمی بێبەشی(شاهین) و (ساحل) وەدەست هاتووە و دەبێ ئەوەش بڵێین کە ئەم دوو تیمە لە ریزی بێبەشترین تیمەکانی شاردەژمێردرێن

ئەم دوو تیمە بەهۆی نەبوونی ئیمکاناتەوە جێ وڕێ یان دایم دەوروبەری شارە.

ئەگەر ئیمکاناتی باش بۆ تیمەبێ بەشداکان پێک بێ و ئەوان چاکتر بتوانن خۆ بۆ داهاتوو ئامادە بکەن، بۆی هەیە کە فووتباڵی بەهێزی دەهەی ٥٠ ی سەقز سەر لەنوێ زیندوو بێتەوە.

تیمی فووتباڵی بۆکان

## درەوشینەوەی فۆتباڵی بۆکان

کەباسی فۆتباڵ کرا ناکرێ ناوی بۆکان نەیەتە گۆڕێ، دوو هۆی «رێک و پێکی» و «تەماشاچی» هەلێکی وای بۆ فۆتباڵی ئەمشارە پێکهێناوە کە دەکرێ بڵێین بێتوو ئێستا یەکێک لە دەستە باشەکانی فۆتباڵی ناوچە نەبێ لە داهاتوودا چاوەڕوانی پتریان لێ دەکرێ. دیارە یاری لەگەل هاوسێکان چیدی بەدڵی بۆکانی یەکانەوە نانووسێ و جار وبار میوانی بە ناوبانگ لە شارەدوورەکانەوە بانگێشتن دەکەن و جاری واشە سەرکەوتنیان دەبێ کە دەکرێ بڵێین ئەو سەرکەوتنانە پتر لەوەی کاری تێکڕایی تیم بێ لە بەرهەمی تێکۆشانی یەک یەکی و فەردی وەدەست دەکەوێ.

باس و لێکۆڵینەوەی زۆرتری فۆتباڵی بۆکان بۆ داهاتوو-یەکی نزیک تەرخان دەکەم. بەڵام پێویستە دوویاتی کەمەوە کە ئەو سەرکەوتنانە بەهۆی تێکۆشانی یاری کەران (بازیگران) و مورەبی گەلێکی وەک "تووتوونچی"، "کۆچەری" و "فاڕووقی ئێلخانیزادە"یە کە لە تەمەنی چل ساڵیدا بیرەوەری " عەلی پەروین "لە مێشکدا زیندوو دەکاتەوە.

جێی سەرنجە هاتنی دەهەزار کەس لە شارێکی چکۆڵە وەک بۆکان بۆ موسابەقەو کەسانێک وەک حاجی بێهنام بە پتر لە ٥٠ ساڵ تەمەن، شار بەرەو گەشە-کردنی وەرزیشی دەباودەیان و سەدان حاجی بێهنام دەکێشێتە نێو ئیستادیۆمەکەی شارو لاوان بەرە و خەباتێکی وەرزیشی هان دەدا.

## ئێلخانی زادە :من رازی....

بۆ ئەوەی وا بیر نەکرێتەوە مەبەستی تێکدانی ئەم باوەڕە سەرکەوتن خوازانەم هەیە، باسی لێکۆڵینەوەیەکی بەربڵاو بۆ داهاتوو تەرخان دەکەم. بەڵام ئەوەی کە جێی باسە و تاری کاک عوسمانی ئێلخانیزادە مورەبی شارەزا و وریای بۆکانە کە دەیگوت: (بەڕاستی دەتوانم بڵێم لە یاڕی نێوان ئێمە و تیمی " **سرخەحصار**"**ی** تاران هەرچەند سەرکەوتن بە ئێمە بوو، رازی نیم).

کاک عوسمان لە بەرزایی سەرکەوتندا باسی کەم و کووڕییەکان دەکا. من باش دەزانم ئەوە هەموو هێز و گوڕی بۆکانییەکان نیە، بێتو گیرو گرفتی تیمی پرسپۆلیس لەگەڵ هەیئەتی فۆتباڵ چارەسەر بکرێ، دەکرێ چاوەڕوانییەکی زۆرتر-مان لەم شارە ببێ. ئەوە جێی شانازییە کە مورەبیانی دلسۆزی ئێمە بە سەرکەوتنێک تووشی هەوای بێ جێ نابن. هەروەک شکانیش نابێ ببێتە هۆی دلساردی و پاشەکشە. لە

هەر سەرکەوتن و شکانێکدا دەرسێک و تەجرەبەیەک بۆ دوارۆژ دەبیندرێ .

**فۆتبالی مەهاباد وهیلالی ئەحمەر ....**

لەچەند سالی رابردوودا تیمی هیلالی ئەحمەری مەهاباد توانیویە جێیەکی باش لە ولاتدا بۆ خۆ دیاری بکا .یاری دو یاری.باشی مەهابادی بە نێوی " جەلالی سمایلزادە" و بەتایبەتی مورتەزا گەنجعلی لەتیمی ئوستاندا جێی سەرنجێکی پترە.چاک دەزانم، ئەوەش هەموو هێزی مەهاباد نیە .

تیمی پرسپۆلیسی سەقز

**فۆتبالی بانە و.....**

بۆ هەموو کەس ئاشکرایە کە لەم هەل ومەرجە ئەستەمەدا ، پەرەپێدانی وەرزیشی بانە کارێکی گەلێک دژوارە . بەلام تیمی هەلبژێردراوی بانە بە

تیمی کاروی سەقز

هاوبەشی لە چەندموسابەقەدا سەلماندوویەتی کە هەر چەند گیر و گرفتیش زۆر بێ دەکرێ لە وەرزشدا وەدوا نەکەون. جێی خۆیەتی سپاسی تێکۆشانیان، با قەلەمیش توانای نەبێ، بکەم .

**دەرسێک لە فاتیح ...**

**لە جێگایەک دەست لە نووسین هەلدەگرم کە هێشتا زۆرم پێ ماوە** .هێشتاش لە شارەکان و جێ دوور و نزیکی ناوچەدا زۆر کەسی واهەن کە لە رێبازی وەرزیشدا ، هەنگاو هەلدێنن و ناویان نەهاتووە کە ناساندنیان و یا تەنانەت هێنانەوەی ناویان پێویستە. هێشتاش تیمگەلێک هەن کە لە ریشتە جۆربەجۆرەکانی وەرزشیدا سەرکەوتوون و میدالیان هێناوەتەوە کە جێی مەقالە ـ یەکی جیاوازە و لێرەداباس نەکراون . هێشتاش گیر و گرفت و کەمایەتییەکی زۆر لە رێی وەرزیشیکوردستاندایە کە چارەسەرنەکراون و سەرنجیان نەدراوەتێ.هێشتاش کەلە پالەوانی بێ ناووپیاوی خێر خواز و تێکۆشەری رێبازی وەرزش هەن کە دەست و مەچەکی پیاوەتییان هەلمالیوە و ناویان نەهاتووە . دەرسێکی بەجێ لە کاک فاتیح کارمەندی تەربیەت بەدەنی سەقز فێر بووم کە گوتی :

**(داوەری موسابەقەیەکی بەسکتبال بووم، لەسەرەتای دەست پێ کردنی موسابەقەدا تۆپم بردە لای (پێش کسوەتێک) کە لە ریزی تەماشاچیاندا بوو و ئیجازەی دەست پێ کردنی موسابەقەم لێ ویست..**

# تۆڵەی ئەژدەهاک

خ: ئەویندار

بەشی دووەم

مام جوامێر بە هەمـــوو
هێز و توانایەوە خەریکـی
پاراو کردنی دەغڵ و دان بوو
و مێشکیشی سەرگەرمی لێک ـ
دانەوە بوو، بە خۆی دەگوت:
خوا پار بۆ ئەوساڵ
بەروبوویەکی باشم دەبێ ،
چاڵەکەم پڕ لە گەنم دەکەم،
کەندووی ئاردی بۆ زەمهەر
داخنمەوە ، بەشی منداڵەکانی
کاک پیرۆتیش دەدەم .ئەوی
ماوە لە قەرز و قـۆڵانـی
دەدەمەوە ، وەک پار ، ئـەم
دەرک و ئەودەرکان ناکەم ،خۆ
من مردم ، جاوەرە کوڕیشت
بکوژن و نانیشت ببڕن،مام ـ
جوامێر هاتبۆوە یادی کـە
پارەکانە سەرەڕای شـەهید
بوونی سوارەی کوڕی بەرهەمی
کوێرەوەری و ڕەنجی یـەک
ساڵیشی ئاگری گرتبوو و بـە
بڕەی بۆمب سووتابوو ، هـەر
چەند خزم و دۆستەکانی زوو
بە فریایەوە هاتن بەڵام چونکە
لە قەدیمەوە گەورەماڵ بوون
و کەمتر وایان لێ قەومابوو
کە بکەونە سەر ساجی عەلی
و زەمهەری خۆیان نەبێ،ئەم
باربووەی زۆر لەبەر گران بوو
کە لوو خەیاڵاتە بۆوە و
سەری هەڵبڕی ئاپۆرەی خێزانی
مام پیرۆتی دی . پێـی
وابوو شتێک قـەوماوە ،
لەسەرەخۆ لە نێو قوڕ و قاڵی
زەوییەکەی هاتە دەر و بەسەر
جۆگەدا ڕۆیی تا گەیشتە سەر
بەراوەکە پێمەڕەکەی لەسەر
شان داگرت ، شێلەگـەی
هەڵبڕی ، بە شاقەلی چۆغەکەی
ئارەقەی نێـو چـاوانـی
سڕییەوە و بە پەلە بـەرەو
ئەو شوێنە ڕۆیی کە خێزانی
کاک پیرۆتی دەستەبـرای
لێ بوو.

ملی باریکەڕێی سەرەوانی
گەنمەکەی گرت ، دوور و
نزیکیان بوو ،دیتی هەر چوار
دەورەی شوانەیان داوە ،
ئەویش بە پەرێشانی قسەیان
بۆ دەکا ئەوانیش زەق
دەیانڕوانییە زار و لێوی و
کەس ورتەی لێ نەدەهات هەر

دەتگوت رازێکی زۆر گەورە و گرانیان بۆ ئاشکرا دەکا . مام جوامێر ئەو پیرە دنیا ـ دیتەیە کە ئاوای دی دوو دڵ بوو، بە خۆی گوت : " حەیف نیە ئەو مەجلیسە خۆشەیان لێ تێک بدەم کە خۆشەویستی و سەفا و باوەڕی بە یەکدی لێ دەبارێ ؟! ئەمما نا ... دەبێ منیش بزانم بۆچی وا لێک هاڵا بوون، بۆ ئەوەی ناخافڵ بەسەریاندا نەدا بە ئارامی لێیان وەدەنگ هات و رووی لە دایکی شوانە کرد .

ـ ئەرێ... براژنەخاتوون ئەوە چاتان نیە ؟ زۆر ماندووم وئێشتیام لە چایە .

وێکڕا سەریان هەڵبڕی ،دیتیان ئەوە مام جوامێری لاق و لەتەر قوراویە ، شەلاڵی ئارەقەیە ، نەرمە بزەیەکی نیشتووەتە سەر لێوان و بە ئەسپایی بۆ لایان دێ، هەموو بەرەو پیری چوون،گەیشتنە پەنایان ، سڵاوی لێکردن و ئەوانیش سڵاویان ئەستاندەوە و بە خێریان هێنا . دەستی بە سەری کچەکاندا هێنا ، ماچی کردن و لاواندنییەوە . هەمین هەستا سەرپێ و هێندەی بلێی یەک و دوو چای دێم کرد و کەتری و چادانی هێنایە پێش. پوورخاتوون وەک هەموو سەرەژنێکی بە قسە ،نەیهێشت پشوویەک بدا ، ئارەقەی بسڕێتەوە یا جگەرەیەک هەڵبەستێ، هەڵیدایە :

ـ ئەوە چۆنە بەسەرت کردووینەوە ؟خۆ بە خودای من هەر چاوەڕێت بووم ، ئەمما دەڵێی دەگەڵ مردنی ئەو پیاوەی دۆستایەتی تۆش دوایی هات . مام جوامێر هەناسەیەکی هەڵکێشا و لە وڵامدا گوتی :

ـ دۆستایەتی من و پیرۆت، دۆستایەتی نەبوو، دەسەد بریا من مردبام و مەرگی پیرۆتم نەدیبا ، خودا ئەو کوڕەشم لێبستێنی ئەگەر فەرقی بایز و شوانە یا ئەم کچانە بکەم ،بەڵام چ بکەم یەکتەنم ،پێناوەستم ،کوێرە ـ وەریم زۆرە ،وەهەموو لایەک ڕاناگەم ،ئێوە هەقتانە گلەییم لێ بکەن،ئەرکی خۆم بەجێ نەهێناوە ،ئەمما چ بکەم پیرم و لەوەی پترم لە دەست نایە .

شوانە پرسی :

ـ ئەرێ مامە لە ئاوداشتن بوویەوە ؟

ـ شوانە ،تا خەلاسیم هات چەقی مەرگم کرد ،ئاوەکە کەم بوو، چاک هەڵنەدەستا و پەلەکانیشی باش پێ هەڵنەدەگیراوە .

چایەکەیان وەختی خواردنەوەی هاتبوو،مام ـ جوامێر و شوانە ئیستکانی خۆیان بە تاڵ کرد. پوورە ـ خاتوون و کچەکانیش وەرسووڕان و پشتیان لە پیاوەکان کرد تا چا خوراوە .

پیرە بە ئەسپایی دەستی بۆ بەر پشتێنی برد، کیسە تووتنەکەی هێنا دەر،قلفەی بەنەکەی راکێشا ، بە ئارامی پزووەکانی رەواندەوە ، خەریکی هەڵوێزنینی زارکی کیسەکە بوو،بە نەرمی سەری هەڵبڕی و گوتی :

ـ پرسیارێکم هەیە بەڵام تۆ خوا لێم مەشارنەوە ....

پوور خاتوون بە خۆی نەوەستا و نەشیهێشت قسەکەی تەواو کا ، هەڵیدایە :

ـ ئەیەرۆ...چۆن شتی لە تۆ دەشارینەوە ، هەرچی بپرسی جوابت دەدەینەوە .

ـ دە کە وایە پێم بڵێن بۆ وا ئالۆزا بوون ؟

ـ شوانە لە شەرمان سوور هەڵگەڕا بەڵام بۆ ئەوەی پرسیارەکەی مام جوامێر بێ وڵام نەمێنێتەوە گوتی :

ـ دایکم هەر لە خۆڕا دەیکاتە هەڵڵا ،دەباڵە خۆمدا کەمێک ئالۆز بووم ، ئەویش کردی بە گریان ئەوجار هەموو هارووژان دەتگوت تەرمی جوانەمەرگێکیان لە پێشە .

ـ ئەتۆ بۆ وا خۆ سەخڵەت دەکەی دایکت سینگت بۆ بکوتێ و ئەو کیژۆڵە هەناسە ساردانە خەم دایان بگرێ ؟

شوانە دیسان سەری لێ شێوا ، زمانی تێک هاڵانەیزانی چ بلێ،یا لە رووی هەڵنەهات گرێی دڵی بکاتەوەونهێنییەکانی

بدرکێنێ ، پێدەنگ بوو ،سەری داخست ، بەڵام هەناسەیەکی ساردی هەڵکێشا ،لێرەدا بوو کە مام جوامێر تێگەیشت دەردێکی کوشندە ئازاری دەدا و رازێکی لە دڵدایە. پێی خۆش بوو سەرەدەری لێ دەر بکا ، بەڵکوو بتوانێ هاودەردی لەگەڵ بکا ،بۆیە گوتی :

– شوانە ،بەرخم ،کوڕی خۆم ژیان پڕە لە چەرمەسەری و ئازار ،پیاو دەبێ خۆ راگرێ و تێیدا هەڵکا ،ئەگەر لەبەر هەژاری و نەداری نارەحەتی ، شکور بۆ خوا ئەو ساڵ بەرهەمێکی باشمان دەبێ و بۆ خۆمان سەرپێکەوە دەنێین، خۆ برالە کەس لە برسان نامرێ! رسق بە دەس خودایە ئەگەر دەردێکی دیکەشت هەیە زۆر حەز دەکەم منیش بیزانم خۆ ئەگەر پێشم چاک نەبێ، خراپتری ناکەم .

– خودا بۆ ئێمەت راوەستاو کا ، مامە گیان، دنیا هێندە نایەنێ، پیاو تا بژی پارووە نانێک هەر دەبێ بیخوا،دەردی من لە برسیایەتی و نەداری زۆر گرانترە ،دەردی من دەردی ئەو خەڵکەیە ( بە پەلە بەڵای راستیدا سووڕا ، دەستی بۆ گۆڕستان راداشت) مەرگی ئەوانەیە پەڕ و پۆی کردوومە و هەمیشە ئازارم دەدا ،

مام جوامێری زگ سووتاوی رۆڵە کوژراو بێجگەلە دراوسێ و خزم و کەس و ئاوماڵ سێ کوڕپەی نازەنینی لە نێو سیفەی ساردی خاکدا نوستبوون، کە بە هۆی بۆمبارانی پەیتا پەیتای دوژمنی بەعسی شەهیدکرا بوون ، بڕینی کولاوە و دیسانیش چاوەکانی پڕ لە فرمێسک بوونەوە بەڵام بۆ ئەوەی ئاوی چاوی نەڕژێتە خوار ،سەری بەرز کردەوە و گریانەکەی قووت داوە ، زیبکی پیاوانەی خۆی پاراست ، سیغارێکی تری دایساند و بە گرژی رووی دە شوانە کرد و گوتی :

– بەڵێ هەرچی دڵمان پێوەیە لێمانی دەستێنن ، هەر کەسێکی خۆشمان دەوێ

دەیمرێنن ، دەزانی بۆ؟ تا تۆڵەمان لێ بستێننەوە ، تۆ دەزانی بێجگە لەو هەموو دۆست و نزیکانەم سێ رۆڵەی شیرینم ،بڕبڕەی پشتم ،گۆچانی دەست و کۆڵەکەی ماڵم بەم ئاگرە سووتاون، تۆ کێت هەڵقرچاوە و بۆتە خەڵوز ، دەمەوێ بزانم مەرگی کێیە لە هەموان پتری شپرزە کردووی ؟

شوانە وەک لە بیری نەمابێ لەگەڵ کێ قسە دەکا ، بە راشکاوی دەستی بە قسە کرد وەک لەگەڵ ئاواڵەکانی بدوێ ، دەریای ژان و ئازاری شەپۆلی دەدا ، دەنا ئەو زۆر لەوەی شەرمێونتر بوو، لەلای پیرە پیاوێک یا لەکن دایکی ئاوا رەپ و راست لە ئەوین و دڵداری خۆی بدوێ و لێفە لەسەر هەتیوان هەڵداتەوە بە درێژی لەسەر خۆشەویستی و مەرگی خۆشەویستەکەی بڕوا.

– مامە گیان ئەم ئاگرە راستەوخۆ دەجەرگ و هەناوی منیش بەربووە . گرفەی ئەم ئاگرە ماڵی وێران کردووم ، هێلانەی لێ شێواندووم ، زۆر هاوڕێ و خۆشەویستی بەرەو دنیای نەبوون لێ رفاندووم وەک شاعیر دەڵێ :

**هەڵیپرووزاندووە لێم زۆر گوڵی گەش**

**مەرگ زۆر خۆشەویستی گرتمە باوەش**

بەڵام لە هەموان گورچووبڕتر ئەو زەبرەیە کە مەرگی خۆشەویستەکەم لێی وەشاندووم ، (رووناک) چڵە پۆپەی هەرە بەرزی ئاواتی ژیانم بوو ،نزیکە سێ ساڵ بوو یەکترمان خۆش دەویست ، بێ یەکتر هەڵمان نەدەکرد ، بەڵێنمان پێک دابوو ، ئەویش مەدرەسە تەواو بکا ئەوجار پێکەوە بژین . لە ئەوین و عیشقەکەماندا ئەوەندە پاک بووین کە قەت درۆمان لەگەڵ یەک نەدەکرد ،بەڵام ئاخ...حەیف و هەزار مخابن ئەویش وەکوو زۆربەی جوانەمەرگەکانیتر بوو بە دەستە چیلەی ئەم ئاگرە بێ ئامانە ، بە هۆی بۆمبارانەکەی زستانی رابردوو بە رووسووری بۆ هەمیشە ماڵئاوایی لە ژیان کرد و بە هەزاران ئاوات و ئارەزووی ژێرینەوە کەوتە نێو گۆڕی تەنگ و تاریکەوە بەڵێ .. . بەڵێ مامە گیان ئەم ئازارەیە برستی لێ بڕیوم و لەباری رووحی یەوە ئەوەندەی تەنگەتاو کردووم کە ژیانم بە تەواوی تاریک دەبینم ،تاریک تاریک وەک شەوە زەنگێکی بەسام و پڕ مەترسی .

مام جوامێر کە تا ئێستا بێدەنگ ببوو و بە وردی گوێی دابووە قسەکانی شوانە هاتەوە بیری کە ئەویش سێ جاری ئەم چارەڕەشی یە تووش بووە کە رەنگە زامی دڵی زۆر لە ناسۆری شوانە بە سفت و سۆتر بێ بەڵام ئەو پیرە پیاوێکی بە ئەزموون بوو ، غیرەتی وەبەر خۆ دەنا ، دەیزانی ئەگەر تاقە فرمێسکێکی لە چاوان بێ ئەو پتر پەشێو دەبێ و ناتوانێ خۆی بەربەست بکا ، جا بۆیە بە دڵسۆزی یەوە رووی تێکرد :

منیش زۆر لەو کارەساتە بە پەرۆشم و خۆم بە شەریکی خەمانت دەزانم بەڵام هیچ دەزانی لە قەدیمەوە گوتوویانە دۆستایەتی دەگەڵ مردوو ناکرێ، جا پیاو نابێ وابکا لە پێ بپەڕێ،پەرۆیەکی لە مامە پیرەی خۆت دادڕە ، چاو لێ بکە دوو شێرە کوڕی چۆنم لە دەس داوە ،دەشزانی کە بێری چاو جوانم کوو لە خوێندا گەوزی ، ئەو خۆشەویستانەیان ئاوا لێ ئەستاندووم و خەلە و خەرمان و بەرهەمی کوێرەوەری خۆم و ماڵ و خیزانەکەشیان لێ سووتاندووم ،دیسانیش دەبێ بە خۆ بوەستم ،تۆش هەروا ، ناچاری تەحەمول بکەی .

شوانە بێ وڵام مابووە سەرێکی بادا و بە تووڕەیی پرسی :

ـ باشە مامەجوامێر پێم ناڵێی بۆ وامان لێ دەکەن ؟ بۆ دەمانکوژن؟ بۆ ئەم ئاگر و ئاسنەمان بەسەردا دەبارێنن ئاخر تاوانی ئێمە چیە؟!!!

ـ کەسی مامی رەنگ بێ تۆش بزانی بۆ وامان دەگەڵ دەجووڵێنەوە ، شارەکانمان بۆمباران دەکەن،ئاوایی یەـ کانمان دەسووتێنن ، خۆشەویستانمان لێ دەستێنن ، نانمان دەبڕن ، قووتی گیان و هێزی لەشمان بە تاڵان دەبەن ، بەڵێ.. تا تۆڵە وەرگرنەوە ، تۆڵە ...تۆڵەی ئەو خوێنمژانەی کە دەرۆستمان نەهاتن و قەتیش هێزی ئێمەیان پێ لە نێو ناچێ .

ـ بەڵێ تۆڵە ... تۆڵە... تۆڵەی ئەژدەهاک ...

# دیاری

## مەتەڵ

سایەقەی سامال
هەوری فەڕەنگی
دوو ئاولەیەک جام
هەر یەک لە ڕەنگێک
" هێلکە "

بلوورین گومبە دێکم بوو
مانگ و ڕۆژی تێدا بوو
کە ڕۆژ هەڵدێ لەنێو گومبەد
بلووری شووشە دەشکێنێ
ئەگەر مەردی و مەتەڵزان
بە بیری خۆت هەڵی بێنە
کە چۆلەکەش هەڵی دێنێ
" هێلکە "

قەڵای گەچی
ڕێت نیە بچی
" هێلکە "
کڵاوی هەمزە پاڵەوان
نە تیکی هەیە نە درووما ن
" هێلکە "

# پەندی پێشینیان

★ زستان سەرهەڵوەشێن بێ
کلک هەڵوەشێن نەبێ.
★ زستان ڕا شەوێ،
پیران ڕا تووێ،
بۆران ڕا هەوێ.
★ خودا کێوان دەبینێ
بەفریان دا وێتێ.
★ بەزستان جارێک دەڵێن
سارده.
★ زستان شەوێکی بمێنێ
کاری خۆی دەکا.
★ مانگی ئادارێ،
ببارێ تاگوێی دارێ،
نامێنێ تا ئێوارێ.
★ برامان برایەتی
کیسەمان جودایەتی.
★ بدە لە هەرد
مەدە لەپردی نامەرد.
★ ئەوەی هەڵیگرت شمشێر
نابێ بترسێ لەشێر.
★ کەر وەچست و چابووک
باوار نەوە ڕۆ،
ژن وەنک و ناموس
با کار نەکەرۆ.
★ خووی شیری تا پیری.

★ جەرب ریا ئاڤێ ڤە دشکێت
★ داری ستوێر نابت کۆپال
★ کەنگی بباری هنگێ زستانە
★ کەو عەزمانێ کەوی دزانت
★ دەستی تنێ دەنگ ژێ نایێ
★ خۆش خەبەرە بەلێ من نەباوەرە
★ شوغلا بچویک مەزن نەکە
★ بەحرا شینە و ئاڤ تێ نینە
★ دیزکا کەڤانی بشکنێت بێدەنگە
★ گوتنێن مەزنا نەقشین لە بەرانە

## من پیرترم

ڕۆژێکی گورگێکی برسی لەگەڵ ڕێوی یەک دەبنە هاوسەفەر. لە ڕێدا گورگ زۆری هێرش بۆدێ لەپڕ روو لەڕێوی دەکا و دەڵێ:

ـ وەرە هەر کامێکمان پیرتر بووین ئەویدی بخوا.

ڕێوی دەڵێ:

ـ من حازرم .تۆ چەند ساڵ دەبی؟

گورگ گوتی :

ـ من زەمانی تۆفانی نووح لە دایک بووم .

ڕێوی دەستی کرد بەگریان .

گورگ گوتی :

ـ بۆچی دەگری ؟

ڕێوی گوتی : بۆ دوومنداڵەکانم .دەگریم.لە تۆفانی نووح دا خنکان .

لێرەدا پڕ بەدڵ سپاسی کاک سەید ئیسماعیلی سەید شوکری ، کاک ڕەسووڵی مەلا، خوشکە نازداری غەفووری . کاک ج .م. شەمزاو ، کاک ئازادعیسا و کاک زریان محەممەد کاکەیی ،دەکەین کە بۆ ڕازاندنەوەی ئەم بەشە یارمەتی یان داوین .

# وەعزی شیرین

دەڵێن یەهوودی یەکا بتی تورکیە خاخامێکیان بوو و زۆر قسە خۆش بوو .رۆژێک داوایان لێکرد بۆ یەهوودی یەکانی ئاڵمان قسە بکا .ئەویش قەبووڵی کرد و چوو. ئەو دەمەی چووە پشت تریبون گوتی :

ـ من بە خۆڕایی قسە ناکەم ٥٠٠ مارکم بۆکۆکەنەوە خەڵکەکەش هەستان ٥٠٠ مارکەکەیان کۆ کردەوەخاخام لە گیرفانی نا و دەستی کرد بە قسە .

وەعزەکەی زۆر شیرین بوو .هەموو لێکرا گوتیان ئەم وەعزە ٥٠٠ مارک دێنێ . خاخام قسەی تەواو بوو و هاتە خوار و دەستی بە گیرفانی داکرد و گوتی :

ـ هەر کەسە پووڵی خۆی هەڵگرێتەوە .

لێیان پرسی ئەوە بۆ واتکرد ؟

گوتی: من پێویستیم بە پووڵ نیە بەڵام پیاو گیرفانی پڕ بێ جوانتر قسەی بۆ دێ .

●●●

# درۆی زل

دوو درۆزن بە رێ یەکدا دەڕۆیشتن . یەکیان لە پێشەوە دەڕۆیی . گەیشتە دێیەک .گوتی:

ـ لەرێگایە جێخوونێکم هێلکە دی ،گێرەیان دەکرد . خەڵکەکە کەشتی وایان نەبیستبوو پێی پێکەنین .

کابرا گوتی :

ـ هەرکەس لە دوای من هاتە ئەم دێیەلێیبپرسن بزانن وایە یان نا .ئەگەر وابوو مەڕێکم بدەنێ .

خەڵک راوەستان هەتا درۆزنی دووهەم گەیشتێ .

لێیان پرسی :

ـ کاکەتۆ جێخوونێکت هێلکە دی گێرەی بکەن .

کابرا کوتی :

ـ نەمدی گێرەی بکەن بەڵام دیتم بەشەنەی بەبابان دەکرد . جووجکە دەکەوتە لایەک و هێلکە دەکەوتە لایەک

رۆژێک کابرایێک دەچێتە لای خەیات و دەستێک کەوا! پاتۆڵ بەدروون دەدا .پاش چەند رۆژ دەچێ وەریدەگرێتەوە تەمەشا دەکا یەخەی نیە . روو لە کابرای خەیات دەکا و دەڵێ :

ـ کاکە بۆ ئەو کەوا پاتۆڵە یەخەی نیە؟

خەیات دەڵێ :

ـ کاکە وامزانی زۆر قەرزداری گوتم با قەرزدار یەخەت نەگرن .

# دەردی دڵ

جارێک مارک توا ین خێزانی نەخۆش دەکەوێ و لە مردن دەبێ.بۆ وەی بزانێ کە مارک خۆشی دەوێ یا نا دەڵێ :

**ـ ئەرێ ئەگەر من بمرم چ دەکەی ؟**

**ـ باوەڕ بکە شێت دەبم؟**

**ـ یا زوو دەچی ژن دێنی؟**

**ـ نانا ئیدی ئەوەندەش شێت نابم ؟**

# تەنز چییە؟

دارا.م

تەنز چیە ؟ تەنز بریتییە لە بەرهەمێکی ئەدەبی سەرنج راکێشکە خەڵک وەپێکەنین بخا و رووداوەکانی لە ژیانی رۆژانەی خەڵکی وەرگیرا بێ و لەو دیاردانە بدوێ کە گیر و گرفت و کۆسپ لەرێگای ژیانی کۆمەڵدا پێک دێنن.لە تەنزدا نووسەر دەبێ مەبەستێکی سەرەکی بۆ لێ دوان دیاری بکا و لە لایەنەکانی دیکە زیاتر گرینگی پێ بدا و باسی لێ بکا

مەبەست لە " وەپێکەنین خستن"ی خەڵکی چیە ......؟ پێکەنین نیشانەی شادی و سەرکەوتنە،ئینسان کاتێک پێدەکەنێ کە هەست بە سەرکەوتن دەکا ،کاتێک بۆی دەردەکەوێ مەسەلەیەکی بەرواڵەت دژوار بەسادەیی قابیلی چارەسەرکردنە ، هێز و توانای رەوانی و جیسمی خۆی بەردەدا و پێ دەکەنێ ، پێکەنین رەنگدانەوەی کاری عەسەبی مێشکە ،کە بە شێوەی بزواندنی دەم و چاو و ماسوولکەکان وەدەردەکەوێ.

باشە ئەگەر پێکەنین نیشانەی شادی و سەرکەوتن بێ ئەدی ئەوانەی کە هێشتا لەژێر باری هەژاری و ستەمدا دەناڵێنن بۆ پێدەکەنن ! ؟

بۆ وەڵام دانەوەی ئەم پرسیارە دەڵێین :

لە پێکەنیندا جگە لە نیشانەی شادی،شتێکی دیکەش هەیە کە دەبێتە مایەی مەرگی کەسانێک ، زۆر سەیرە! شتێک شاد و دڵخۆشکەر بێ، کەچی لە هەمان کاتدا مایەی مەرگی کەسانێکیش بێ !! ....

راستییەکەشی ئەوەیە کە پێکەنین،ئەو کەسە ناکوژێ کە پێدەکەنێ،بەڵکوو ئەوە دەکوژێ کە بۆتە مایەی ئەو پێکەنینە و خەڵکی پێی پێدەکەنن.کاتێک تۆ بە کەسێک پێدەکەنی ، ماناکەی ئەوەیە کە بە سووک و نابووت و بێ قەدر تەماشای دەکەی و بە پێکەنینەکەت خۆ بە سەرکەوتووتر و بەهێز و تواناتر لەوی دەبینی .

دەبێ ئەوەش بزانین کە تەنز تەنیا شادی و پێکەنینی تێدا نیە ،بەڵکوو رق و تووڕە- یی و بێزاریشی تێدایە کەوەک هەورێکی رەش و تاڵ هەڕەشە لە خۆری پێکەنینەکە دەکەن و و تەنانەت لەنێوان پێکەنینە- کانیشدا نهێنی گریان و فرمێسک بەدی دەکرێن . ئەو جۆرە پێکەنینانە لە کوێوە هەڵدەقوڵێن ؟...

ئینسانی رەنج کێش کاتێک ئاوا پێدەکەنێ،دوژمنەکەی خۆی لەرووی ئەخلاقی و مەعنەو- ییەوە تێک دەشکێنێ و رێ و شوێن و رەوشتیان بە هیچ دەگرێ وجگەلەتاریکاییەکی پڕوپووچ بە هیچی دیکەی نازانێ کاتێک خۆی لەگەڵ وان بەراوورد دەکا ،ئەوان بە فس فس پاڵەوان و خۆی بە نەوەی دێوان دەزانێ،دەنا یەکێک کە دەبینێ وڵاتەکەی لە لایەن دوژمنانەوە گەمارۆ دراوە و لەبار و وەزعێک دایە کە نائومێدی پێوە دیارە چۆن پێدەکەنێ...! ؟یەکێک کە دەبینێ سەدان دەردی کۆمە- لایەتی جەرگی گەلەکەی کوڵیوە چۆن پێدەکەنێ...! ؟ بەڵام بێگومان ئەو پێکەنینە پێکەنینی ئینسانی پێشکەوتوو خوازە ،پێکەنینی ئینسانێکە کە باوەری وایە قانوونە کۆمەڵایەتییەکانی تەبیعەت مژدەی سەرکەوتنی دەدەنێ . پێدەکەنێ تا بە پێکەنینەکەی خۆی،تاڵی تێکشکانەکانی ئینسان لەنێو بەرێ.

لە لایەکی دیکەوە کاتێک خوێنەر بە تەنزێک پێدەکەنێ.

تەنانەت بەولایەنە خراپانەش پێ دەکەنێ کە لە خۆیدا هەن. «گۆگۆل»(١٨٠٢-١٩٠٩) لە جەنابی "موفەتیش"ەکەی خۆیدا دەڵێ: "ئێوە بە کێ پێدەکەنن؟ ئێوە دەتانەوێ بەخۆتان پێبکەنن! ماناکەشی ئەوەیە: ئەو چاکەیەی کە لەگیانی ئێوەدا بێدارم کردۆتەوە، بەنابەجێ-ترین شتەکانی ناو خۆتان پێدەکەنن.

جا ئەو کەسەی کە بیەوێ کارێکی ئاوا بنووسێ، پێش هەموو شتێک دەبێ وردبین بێ، واتا بە وردی ئاگاداری ژیانی رۆژانەی خەڵکی بێ و ئەو گیروگرفتانە بدۆزێتەوە کە هێشتا خەڵکی بۆخۆیان باش نازانن لەکوێوە سەردێننەدەر

جیاوازی نووسەرێکی ئاسایی دیکە لەگەڵ تەنزنووس لەکوێ دایە؟نووسەرێکی ئاسایی کاتێک مەقالەیەکی جیددی لەسەر مەسەلەیەکی گرینگ دەنووسێ ئەو نایەوێ کە هەر لەپێشدا دوژمن تێک شکاو نیشان بدا، بەڵکوو لەوانەیە لەتۆ بەهێز-تریشی بخاتە روو. بەڵام تەنز-نووس بەگاڵتە و پێکەنینەوە خەڵکی بانگ دەکا و هەر لە پێشەوە سووک و بێ نرخ تەماشای دوژمن دەکا و سەرەنجام مەحکوومی دەکا و بەسەریدا زاڵ دەبێ. بەڵام لێرەدا پرسیارێک دێتە گۆڕێ ئەویش ئەوەیە: کاتێک باسی "سەرکەوتن بەسەر دوژمندا" دەکەین ئایا بەڕاستی دوژمن لەناو دەچێ و دەمرێ........؟ راستییەکەی ئەوەیە کە ئەو سەرکەوتنە زیاتر لەوەی ماددی بێ ئەخلاقییە. تەنز نووس تەنیا خوێنەر بۆ تێکۆشان و کارکردن بانگ دەکا و هانی دەدا و هیوای پێدەدا، هەروا کۆن و کۆنەپەرستی لەبەر چاو ناشیرین و ریسوا دەکا. گرینگی گەورەی تەنز لە ئەدەبیاتدا ئەوەیە کە ئینسان بە ئاسوودەیی یەوە خۆی لە کۆت و پێوەندەکانی رابووردوو جودا کاتەوە و نەخشەی لەبار بۆ داهاتوو بکێشێ. پێکەنین ئینسان فێر دەکا و یاریدەی دەدا تاخۆی لەزۆر رێ و شوێن و رەسمی کۆن ئازاد بکا. خراپترین ئینسان ئەو کەسەیە کە رابووردوو لە وجوودی دا قووڵتر لە خەڵکی دیکە ریشەی داکوتاوە.

کە واتە لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ کە تەنز شتێکی بێمانا و تەنیا بۆ سەرگەرم کردنی خەڵکی نیە، بەڵکوو لە پلەی یەکەمدا دەبێ گرنگی بە ناوەرۆک و جەوهەری کۆمەڵایەتی بدرێ.

نووسەری تەنزیش وەک هەموو نووسەرێکی دیکە بۆ ئەوەی باش بنووسێ، دەبێ خۆی لە جێگای خوێنەر دابنێ، دەبێ بەچاوێک تەماشای بەرهەمەکەی بکا کەوەک ئەوە وابێ تازەبابەتە و بۆ یەکەمین جارە دەیخوێنیتەوە و خۆی بەشداریی یەکی تێدا نەکردووە. دەبێ دڵنیاش بێ لەوەی کە بەرهەمەکەی تەنیا بۆخۆی تێی ناگا، بەڵکوو نرخەکەی لەوەدا دەبێ کە بە تەواوی قابلی تێگەیشتن بێ.

جا ئەگەر لێرەدا برێک بگەڕێینەوە نێو ئەدەبی کوردی خۆمان و گەڕانێک بەدووی تەنزدا بکەین، بەئاسانی دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە بە داخەوە لەو بارەیە شتێکی ئەوتۆ وەبەر چاوان ناکەوێ کە شایانی باس و لێکۆڵینەوە بێ.

هەرچەندە لە ئەدەبی کوردیدا هەر وەک دەزانین بە شێوەیەکی گشتی پەخشان لەچاو شیعر لە دوایە، بەڵام پێم وایە لەوەیدا ئەدەبی تەنز لەدوای هەموانە، لە کاتێکدا دەتوانم بڵێم: تەنز لە هەموو بەشێکی دیکەی ئەدەبی خوێنەری زیاترە.

ئیدی بەهیوای هەوڵ و کۆشش و کارکردنی ئەو کەسانەی لەوبوارەدا بەتوانا و لێ زانن.

**بۆ نووسینی ئەم باسە سوود لەم سەرچاوانە وەرگیراوە:**

١- مکتبهای ادبی- جلد ١

٢- دربارهٔ ادبیات- «لونا چارسکی»

٣- از پوشکین تا شولوخوف
ترجمه: ع امینی و م سجودی

## ئەگەر جارێ ... ژیوا

وەنەوشەی جوان و نەشمیلی بەهاری
کەتۆ رەحمی بەحالم کەی بەزاری

وشەی تازەت بەیادی هەڵدەرێژم
دەکووژم غەم، خەفەتباری دەنێژم

بەیادی تۆوەیە وامەست و شادم
لەرووی دونیا بەتەنیا تۆی مرادم

کە بێتو لێو بزێوی تۆ لەسەر لێو
دەتارێ غەم لە دڵما شەشحەوت کێو

کەبێتوو خێسەیەکمان پێ بدەی تۆ
غەم و مەینەت لە دڵما بۆدەبی کۆ؟

کەبێتو بێیە لامان جار و بارێ
هەچی غەمبارییە و حەسرەت دەتارێ

ئەگەر جارێ بەیادم کەی بەخۆشی
کلۆی سەر ژینی من پاک دادەپۆشی

بزەت گەر بێتە سەرلێوی شەکەربار
لەبەرچی من دەبم غەمبارو بێزار ؟

ئەتۆ مانگی گوڵم ،ئەستێرە ،خۆری
فریشتەی تۆ، ونۆسی یانە حۆری ؟

## بۆنی بەهار

سابیری خودامرادی

وەکوو بیستوومە دەڵێن سروە سبەی دێتەوە
سبەی لە هەر زمانێ دەنگی ئۆخەی دێتەوە

هەرچی ئەدیبی کوردە تینووی دیداری سروەن
بۆیە هەموو چاوەڕێن خودایە کەی دێتەوە

سروە ئاواتی کوردە یاخوا هەر ئاوا نەبێ
هەر خۆش بێ ئەم بەهارەلەمانگی دەی دێتەوە

بەڵێ بەهارە سروە نەک هەرتەنیا بەهارێ
بەڵکوو بۆنی سەد بەهار لەهەروشەی دێتەوە

خۆشەویستێکە مەزن گەورە و بەنرخە سروە
ئەوینی گەلی کوردە بۆ گەلەکەی دێتەوە

خەم و پەژارە دەڕوا لەبەرسروەی نەسیمی
خۆشی و شادمانی لە گەڵ شنەی دێتەوە

# لەگەڵ شیعری

## «ماموستای دلسۆز»

برام هاودینم هاونیشتمانم
هیوای داهاتووی وڵاتی جوانم

لە ژێر چ زەبرێک بێ حاڵ وکاسی ؟
ریشەی دەردی خۆت لە چی دەناسی ؟

ئەودەردەی ئەتۆ پێوەی دەناڵی
بۆت بەیان دەکەم حاڵی بە حاڵی

وابیر مەکەوە ماددەرزادی یە
دەردی نەزانی وبێسەوادی یە

ئەگەر ماموستا تووڕەش بێ لە تۆ
دەبێ بزانی لەبەر چیەو بۆ ؟

ئەوە دەزانێ نەخوێندەواری
دەردێکی سەختە و زامێکی کاری،

ئەوەی پێش دەگرێ بەکاروانی شەو
ئەوەی بانگ دەکا راپەڕن لە خەو

ئەوەی هەمیشە خۆشی تۆی دەوێ
ئەوەی پێی خۆشە گەلی سەرکەوێ

ئەوە ماموستا دڵسۆزەکەتە
چرای رووناکی رێی هۆزەکەتە

رێزی لێ بگرە جێگای خۆیەتی
هەر ئەو پەرۆشی ژینی تۆیەتی

«ناسری ئاغابرا»

## سروەکەهات

"کـ.د. ئازاد"

لەخۆشترین ڕۆژی سالم ،
نائومێدی شەوێ تاریکی دامەزراند..
بەو شەوە تاریک و تووشە ،
لە سێبەریشم دەترسام .
لە دەروونما گورگێکی برسی دەیمڕاند!
کە دەستی بێ باوەڕی من ،
پەردەی شڕی شەوی دڕی ،
نوورێک درا لەچاوی من .
تەمی شەوگار دەڕەویەوە ،
خۆر لانەی بەختی خۆی چێ کرد .
لەنێو دلّی هەراوی من ،
" سروە کە هات ؛
دڕی دەدا بە باوەڕی شەوی شڕۆلّ ،
" ئازاد"ی کرد بە خوێنگری هەتاوی من !

## کۆتری خەیال

ج. قەقنەس

ئەمڕۆ کۆتری خەیالّ و بیرم
لە کونجی جەستەی خەستەی ئەسیرم
فڕی بالّی گرت بەرەو سەماوات
تا بگاتەشار ،ئارەزوو ئاوات
تالە هێلانەی ئازیزان، یاران
بحەسێتەوە لە لای دلّداران
هیوایە یاران بالّی نەشکێنن
تووی نەومیدی لە دلّی نەڕوێنن
ئەم بالّەندەیە گەلێ ماندووە
باو بۆران بالّی زۆرتەزاندووە
ئەفڕێ هەتا کولە هێلانەیان
گەرم کاتەوە جسم وتەن و گیان
هیوایە یاران نەیخەنە قەفەس
بەئاگری قارنەیکەنەقەقنەس! ...

# شاعیرانی لاو

## "هیوای جێژن"

شنەی شەمالّە هاژەی دێ
جۆگەلەی بەست ئاوی بەفرێ

قەلّبەزەکەی بە ئاهەنگێ
بە ئاهەنگ و جۆرە دەنگێ

بە گۆرانی دەیلێتەوە:
" ئەوە بەفرە دەتوێتەوە

زستانە سەر دەنێتەوە
دەرگای بەهار دەکرێتەوە

وەنەوشە روو دامەپۆشە
نیزیکە ئەو ڕۆژە خۆشە

ئەگەر کورتیش بێ تەمەنت
تاوێک دەڕوانیە وەتەنت

شنەی شەمالّە هاژەی دێ
لکی دارانە رادەژێ

ئەو لقانەی رادەوەشێن
گۆرانیەکی دیکە دەلێن

دەلێن گۆرانی بۆ مەلان
بۆ بالّندەی چڕ و تەلان

وەخۆ کەون بەرەو ژیان
نەما زستانی پڕ زیان

هێلانەکان نوێ کەنەوە
سروودەکان بخوێننەوە

ئەو سروودانەی ئێواران
رێک و پێکتر لەهی جاران

بەیانان بە ئاهەنگ گێران
ساز کەن بەزمێ بۆ وەرزێران

شنەی شەمالّە هاژەی دێ
جۆگەلەی بەست ئاوی بەفرێ

لکی دارانە رادەژێ
گیان لەبەرانن چاوەڕێ

دەنگی تازەیان دێتە گوێ
ئاخۆ ئاواتیان وەدی دێ ؟

هەموو بەهیوای ژیانن
بۆ رۆژی خۆش چاوەڕوانن

لە زستانی سڕ بێزارن
دەستەودامێنی بەهارن

بەو هیوایە ئەو ڕۆژە بێ
جێژن و خۆشی بۆ شارودێ

"مستەفا شێخە"

هەبوو نەبوو پیرێژنێـــک بوو پیرێژن ! جا دەڵێ پیرێژن لە دارەتی دنیایە تـەقـە بزنێکی هەبوو . هەموو رۆژێ شیرەکەی هەوێن دەکرد و لـە حەسارێ لەبن سوێنـــەی دەیشاردەوە .

رێویەکی بەدفەڕیش هەبوو بەشیری پیرێژنێ فێر بـوو . جار دەگەڵ جارێ کە پیرێـژن چاوی خافڵ دەبوو ، رێـوی دەچووە زگ سوێنە وشیـرەی دەخوارد .

پیرێژن نەیدەزانی ئـەو چۆرە شیرەی هەوێنی کـردووە چی لێ هاتووە . هەتا رۆژێکی کوتی "ئەو حاڵە بەوحاڵـــە ناشێ " تەوەرداسێکی هەبـوو ، دەستی دایەو خۆی لەکەلێنێک مەڵاس دا .تەوەرداسیش ئەوەندە تیژ بوو مووی دەکرد .

لەسەر قـــەرارێ . رۆژان هێندەی تێوەرنەسووراوە مـام رێوی پەیدابوو . چاوێکـــی لەولاوئەولای کرد و غـاریـدا سوێنەی . پیرێژن نەیکـــردە نامەردی تەوەرداسی هەڵێنا و بەهەموو دەمایە خۆی تـەوەر- داسێکی داهێنا رێویێ .

رێوی دەرپەڕی ئەمما کلکـی وەبەرهات و قرتاندی.بەچۆڕە چۆڕی خوێنێ رێوی تێ هەڵبۆوە بۆ کن ئاواڵەکانی .پێیـــان کوت ئەدی کوا کلکت ؟هـەموو قومارییان پێکرد .لەتـــاوان پەنای بۆ پیرێژن بردەوە و کوتی : .

ـ داپیرە ئەمن کردم ئەتۆ نەیکەی وەرە مەردی خودای بە کلکە قولەم وێدەوە .

پیرێژن کوتی : دەی دەی مـام رێوی هەتا شیرم لێدەخـۆی دەخۆی دەنا ئەوجار کلکـــە قولەت دەوێتەوە ؟

مام رێوی کوتی: قەول بێتازە زیانی نەکەم . وەرە پیـاوی چا بەکلکم دەوە ، ئـابرووم چوو . پیرێژن دەڵێ : بـڕۆ شیرەکەم بۆ بێنەوە لەجێـی خۆی دانێوە هەتا کلکەقولەت وێدەمەوە .

مام ریوی چارەی لێ بڕاوچـوّ

کن بزنی گوتی :

**بز شیردا بۆ داپیر دا**

**بەشکە کلکەقولّەم وێدا**

بزن کوتی : هەستە بچۆ کن داری گەلاّم بۆ بێنە باشیرت دەمێ.رێوی ئەوجارچۆ کن داری کوتی :

**دار گەلاّ دا بۆ بز دا**

**بز شیردا بۆ داپیر دا**

**بەشکە کلکە قولّەم وێدا**

دار کوتی : مام رێوی هەستە بچۆ ئاوێ بێنە ئاوم دەبن کە بالق و پۆپی دەرکەم جا ئەو جار وەرە گەلاّت دەدەمێ .

مام رێوی ئەوجار چۆکن کانی. کوتی :

**کانی ئاودا بۆدار دا**

**دار گەلاّ دا بۆ بز دا**

**بز شیر دا بۆ داپیر دا**

**بەشکە کلکە قولّەم وێدا**

ئەوجار رێوی چۆکن کیژان کوتی :

**کیژ چۆپی کا لە کانی‌کا**

**کانی ئاودا بۆ دار دا**

**دار گەلاّ دا بۆ بز دا**

**بز شیردا بۆ داپیر دا**

**بەشکە کلکەقولّەم وێدا**

رێوی هەستاوەڕێ کەوت خۆی گەیاندە وەستاو گوتی:

**وەستا کەوش‌کا بۆکیژکا**

**کیژ چۆپی کالە کانی کا**

**کانی ئاودا بۆ دار دا**

**دار گەلاّ دا بۆ بز دا**

**بز شیردا بۆ داپیر دا**

**بەشکە کلکەقولّەم وێدا**

وەستا کوتی : بچۆ هێلکەم بۆ بێنە .

رێوی چۆ کن مریشکی . کوتی:

**مرهێلکە کا بۆوەستاکا**

**وەستا کەوش‌کا بۆکیژ کا**

**کیژ چۆپی کا لەکانی کا**

**کانی ئاودا بۆ دار دا**

**دار گەلاّ دا بۆ بز دا**

**بز شیردا بۆ داپیر دا**

**بەشکە کلکەقولّەم وێدا**

مریشک کوتی : بچۆ هەرزنم بۆ بێنە !

کانی کوتی : دەنا ئەگەروایە بچۆ کیژان بێنە بالەسەرم چۆپی بکەن ئەودەم ئەمیش ئاوم وێدێ .

کیژ کوتیان : ئەمە کەوشمان نیە ، داوەتیش بێ کەوش ناکرێ بچۆ کەوشمان بۆ بێنە جا لەسەر کانی هەڵدەپەڕین .

بەڵێ جادەلێ رێوی رۆیی . کەم رۆیی زۆر رۆیی گەیشتە کابرایەکی گێرەی هەرزنی دەکرد .

ئەویش کوتی : مامە پیرە ! گێرەی لێ خورە بادەست و دم

و چاوم بشۆم و وچانێکی بدەم دوایە هەرزنت دەدەمێ .
کابرا رۆیشت بۆ سەرکانی .
رێویش چاوێ گێرا قۆپیەک دیار بوو . خۆی دەقۆپی هەلکێشا و هاتەوە. دەنێو هەرزنیندا گەوزی . هێندەی هەرزن پێوە نووسابوو نەیدەتوانی بڕوا .

مامە هەرزن دابو مردا
مرهێلکە کا بۆوەستا کا
وەستا کەوش کا بۆکیژ کا
کیژ چۆپی کا لە کانیکا
کانی ئاودا بۆ دار دا
دار گەلا دا بۆ بز دا
بز شیر دا بۆ داپیر دا
بەشکە کلکەقولەم وێدا

کابرا کوتی : باشە جارێ وەرە زۆر ماندووم .برێک

هەر چونێک بوو هەلات هاتەوە کن مریشکێ . لەوێ

خۆی تەکاند مریشک هەرزنی خوارد ،هێلکەی کرد . هێلکەی برد بۆ وەستای . وەستا کەوشی دایە کەوشی برد بۆ کیژان . کیژ لەسەرکانی چۆپیان کرد . کانی ئاوی هاتێ.دار گەشاوە . گەلای برد بۆ بزنی .بزن شیری دایە شیری برد بۆ داپیرەی داپیرە کەلکە قولەی وێداوە .
ئەمیش لەولای راهاتمەوەکالەم دڕا چم پێ نەبڕا .

## نەخوێندەوار بێکەسە

بووکە باغەی نەخشینم
کۆرپەی ساوا و شیرینم

هەستە لە خەو بەیانە
کاتی کایە و سەیرانە

تۆ وەک گولی بەهاری
کەسک و سوور و نازداری

خۆت زۆرجوان دابپۆشە
دابچینە کانیە خۆشە

لە عەمری منت کەوێ
چاوجوان، خوێن شیرن"کەوێ"

گۆزەلەت لە بیرمەکە
تا ئاو بەرین بۆ مەشکە

دایە چاوەڕێمانە
هومێدی زۆر پێمانە

دەم و چاوەکەت بشۆ
لە پاشان نانی بخۆ

خێرا بچۆ مەدرەسە
نەخوێندەوار بێکەسە

س ـ سیروان

خوێنەرانی بەڕێزی "ســروە "

وێڕای سڵاو لە ئێوە ئازیزان کە لە ماوەی ساڵی رابردوودا بە هەر شێوەیەک لـــە دەستتان هات یارێدەتان داین وبە دنەدان ورێزگرتنی خۆتان شەرمەندەتان کردین. پشتیوانی خۆتان لە بڵاوبوونەوەی سروەدەربڕی .بە تایبەت هونەروەران،ئەدەبدۆستان ، زانایـــان و نووسەرانی خۆشەویست کە بە ناردنی شعر و وتار وچیرۆک و... بوونەهۆی ئەوە کە ئەم گۆوارە نێوەرۆکەکەی بە دڵی ئێوە بێ. دەستەی نووسەرانی سروە بە پێویستی دەزانێ لە هـەمـوو ئەو ئازیزانەی لە ساڵی رابردوودا بەهەر شێوەیەک یارێدەیان داوین ، رێـــز بگـــرێ و سپاسیان لێ بکا .

بە ئاشکرا دەبێ ئەم مەسەلە رابگەیەنین کە بڵاوبوونەوەی سروە مەدیوونی هاوکـاری و یارمەتی ورێنوێنی زوربەی ئەم خوشک وبرایانەیە کە لە نزیک ودوورەوە یارمەتییان داوین . گۆواری سروە لە ساڵی داهاتووشدا هەر بە هاوکاری بەردەوام وپتری ئێوە خۆشەویستـــان دەتوانێ دەرچێ .ئێمە بەڵێنی دەدەین ئەوەندەی لە توانامان دابێ، باشتر و جوانتربوونـــی ئەم گۆوارە تێ بکۆشین بەڵام بە مەرجێک کە دۆستان لە بیرمان نەکەن وهەرچی لەدەستیـــان دێ سەبارەت بە سروە دەریغی مان لێ نەکەن .

بەراستی ئەم هاوکارییانە بۆ ئێمەجێگای شانازین . کە وابووبانگەوازی گـــۆواری خۆتان قبووڵ بکەن وبە ناردنی نووسراوە، سووژەی جوان ، مەسەلەی نوێ وناساندنـــــی هونەر و ... بۆ دەرچوونی گۆوارێکی پڕنێوەرۆکتر سروە یاریدە بدەن .ئێمە پێویستمـــا ن بەم مەسەلانە هەیە :

١ــ تەحقیق ، لێکۆڵینەوە ، کۆکردنەوەی بەیت وباوی کۆنی کوردی بە شێوەی نووســـراوە، یا وێنە یانەوار و یا بەسەرهاتی ئەوانەی ئەم بابەتانە دەزانن .

٢ــ نووسینی وتاری تەحقیقی لە زمینەکانی جۆرا وجۆری عیلمی ، ئەدەبی ، عەقیدەتـــی عیرفانی وهونەری ( بە زمانی کوردی یا فارسی )

٣ــ نووسین یا کۆکردنەوەی باسە مێژوویی یەکان وەک :

الف : بێگانە لە کوردستاندا

ب : ئیسلام وکورد

ج : ناودارانی کورد و ... " بە زمانی کوردی یا فارسی "

٤ــ تالیف وکۆکردنەوەی باسە مێژوویـی وجوغرافیایی یەکان ورەسم وباوی شارە کـــورد نشینەکان وژیانی عەشیرەیی ( بە زمانی کوردی یا فارسی )

٥ــ تالیف وکۆکردنەوەی زمان وئەدەبیاتی کوردی وەک رێزمان ورێنووس وفەرهەنگــــی زاراوەیی و فەرهەنگی وشەکان و.....

٦ــ نووسین وکۆکردنەوەی چیرۆک بۆ منداڵان ( بە زمانی کوردی یا فارسی )

٧ــ کۆکردنەوەی پەندی پێشینیان وقسەی نەستەق وفەرهەنگی عامیانە

٨ــ نووسینی تەنزی کۆمەڵایەتی

٩ــ کێشانەوە یا ناردنی وێنە یا خەت، تەرح ،وکاریکاتۆر و ....

١٠ــ وێنە هەڵگرتن لە سووژەی تەبیعی ( جوغرافیایی ) مێژوویی ، کۆمەڵایەتی ئابووری و..

١١ــ نووسین وکۆکردنەوەی وتارەکانی جۆرا وجۆر وەک باسی بنەماڵە ، مافی ژن ، کـــارو کرێکاری ، بێهداشت ودەرمان ، کشت وکاڵ وئاژەڵداری و ...

١٢ــ لە ئاکامدا ئەو باس ووتارانەی بە دڵتانە وپێتان شک دێ .

تکایە نووسراوەکانی خۆتان بە ناونیشانی

" ارومیه ــ صندوق پستی ٧١٧ " انتشارات صلاح الدین ایوبی " بەرێ بکەن

وێڕای رێزو سپاس

دەستەی نووسەرانی"ســروە"

سپاس بۆ خودای بەرز و بێ هاوتا کە یارمەتی داین چوارەمین ژمارەی "سروە" لە چاپ بدەین زۆربە پێویستمان زانی بۆ ئاگادار بوون لە چلۆنایەتی نێوەرۆکی گۆوارەکە لە هەموو بارێکەوە راونەزەری خۆشەویستان بزانین . ئەوەشمان بۆدەرکەوێ کە لە سالّی رابردوودا سروە توانیویەتی تاچ رادەیەک خوێنەران رازی بکا . لێرەدا لە هەموو خوشک و برایانی بەرێز داوا دەکەین رای خۆیان دەربڕن و بۆ ئێمەی بنێرن و بەوەلام دانەوەی ئەم پرسیارانە بەرێوەبەرانی "سروە" یارمەتی بدەن .

* * * *

ناو وشورەت ................ تەمەن ........ ژن / پیاو ............ ئیش وکار ........

ناونیشان ..................................

نووسینی ناوونیشان بەقەد ئەوانی تر پێویست نیە بەلّام ئەگەر بنووسرێ باشترە .

* * * *

١ ـ تائێستا سروەتان خوێندوتەوە ؟ چ ماوەیەک و چۆن ئاگاداری دەرچوونی بوون ؟

٢ ـ سروەتان خوش دەوێ ؟ بۆ ؟

٣ ـ کام بەشی سروەتان پێ خوشترە وکام بەشتان پێ ناخوشە ؟ بۆ ؟

٤ ـ بۆ تەکمیل بوون وپرنێوەرۆکتر بوونی سروە چ پێشنیارێکتان هەیە .سەرچاوەمان پێ بناسێنن و ئەگەر بۆخوشتان دەتوانن یاریدەمان بدەن ؟

٥ ـ بەرای ئێوە سروە دەبێ چ رێبازێک بگرێتەبەرو چ پێ سپێراوی یەکی هەیە .

٦ ـ بەگشتی دەرچوونی سروە لە ماوەی سالّی رابردوو چۆن بوو وهەلّوێستی چ بوو ؟

٧ ـ ئەگەر لە داهاتوودا پاشکۆ (ضمیمە ) مان بۆ سروە هەبوو بەرای ئێوە دەبێ زۆرتر چ بابەتێکی تێدابێ .

٨ ـ بۆ پتەوتر بوونی هەرچی پتری پەیوەندی نێوان سروە و خوێنەران چ پێشنیارێکتان هەیە .

٩ ـ نەزەرتان لەبارەی ماوەی دەرچوون ، قیمت ، شکلّ و ئەندازەی گۆواری سروە چیە ؟

١٠ ـ هەر چەشنە رەخنە و پێشنیارێکی دیکەتان پێشکدێ بۆمان بنووسن ؟

**تکایە وەلّامی خۆتان بەخەتێکی خۆش ( کوردی یا فارسی ) بەم ناونیشانە بەرێ بکەن :**

**ارومیە : خیابان شهید باکری ـ نبش کوی ساعد ( صندوق پستی ٧١٧) انتشارات صلاح الدین ایوبی .**

**ئەگەر لە گەل گیروگرفتێک لەم بارەدا بەرەورِوو بوون پەیوەندی لەگەلّ شمارەتلفنی ٣٥٨٠٠ بگرن .**

# زستان

سەیدکامیلی ئیمامی
(ئاوات)

زستانە ،بەفرە ،حەشرە ،وڵات پڕ لە ناڵە نـاڵ
دێوی سپی بە قینەوە هات بۆتە پیرە زاڵ
هێن قورسە ،هێن گرانە ، هەڵستانی حەستەمە
وەک مۆتە کە لە سەر سەروسنگمانە مانگ وساڵ

سەر سنگمانی گرت و هەناسە نەما بە کەس
کەوتووینەژێر کلیلەوە دەبزووینەوە بە حاڵ
ئینسان لە ژووریٚ ماونەوە وەک کەوی قەفەس
وەک مەیتە پیرەلۆکێ لە عەرزا ببێ شەلاڵ

ماوین بەڵام چ مان؟ بە خودا مەرگ خوشترە
مەرگێکە نێوی ژینە چ ژین؟ ژینی ترش و تاڵ
بێ باڵ نەماوە گەر دەرەتانی تەنانەتیش
باڵدارەکان فەقیرە هەموو کەوتوون لە باڵ
هەر پێکەنین بووکاتی بەهاران دەهاتە گوێ
هەر زیڕە زیڕە ئێستە لە سەرمان و زاڵە زاڵ
کیژان بەتوێی کراسێ لەگەشت بوون وگوڵ چنین
ئێستا لە خۆوە گۆوە دەکەن سەد سڕو سیپاڵ
خۆزگە تەمەن ببایە کە دیبام بە چاوی خۆم
ئەو کاتە خۆشە دێنەوە سیسارک و پیرە داڵ
یادی بە خێرێ کاتی بەهارو کزەی شەماڵ
سەیران و شایی گرتنی لاوان و کیژ و کاڵ
چەن شۆخ وشەنگ وجوان ولەبەردڵ دەچوونە باغ
بەرزو بڵندو دڵبەرو لێو ئاڵ و چاو کە ژاڵ
یادی بە خێرێ قیڕەیی قاز و قورینگەکان
پۆل پۆل دەهاتەوە لە سەرا وابە قیل و قاڵ
یادی بە خێرێ ئەو دەمە قاسپەی کەوان دەهات
جوانیان دەڕشت نێرە و مێ ریزە وردە خاڵ
ئەو کاتە ئەو دەمانە کە خێڵ دەچنەبەندەنێ
یادیان بە خێرێ بێری و کابانی گەورە ماڵ
جێژوان بە تاڵە ،داخۆ کوڕو کیژی نیشتمان
هێشتا لە بیریانە بە دڵ دادەکەن خەیاڵ؟
داخوا دوبارە دێتەوە گوێمان ودێ بەهار :
دەنگی شوان و تووڕەیی بلوێر لە هەردویاڵ ؟
داخوا دەگەینە فەسڵی بەهارو دەژینەوە :
وەک گیا و گوڵ لە ژێرزەوی یادێدەرمناڵ؟
کاکی "ئیمامی" تۆ تەمەنت زۆرە حەستەمە
بووژانەوەت بە تاوی بەهار موشکوڵە و محاڵ